دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

## پۆست مۆدێرنیزم و ئـــەقـڵ و ئــــایین


- نووسینی: ئەرنست گیلنەر
- وەرگێڕانی: بەهزاد حەوێزی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- بەرگ: موراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: ٢٦٧١
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٣٣٩)




ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



## ناوەڕۆک

## پۆست مۆدێرنیزم و ئەقڵ و ئایین

ئەرنست گیلنەر لەبارەی کێشەکانی ئیمانداریێتی بڕوای بە سێ بژارەی ئایدیۆلۆجی هەیە، کە ئەمڕۆ لەبەردەمماندا رەخساون، یەکەمیان: گەڕانەوەیە بۆ ئەو ئیمانە رەگاژۆ و رەسەنەی نێو یەکێك لەنەریتە کلتورییە ئایینییەکان، لەکاتێکدا ئەوەی دیکە لە شێوەیەك لە شێوەکانی ڕێژەگەراییدا خۆی دەبینێتەوە، کە دەستبەرداری گشت بیرۆکەی یەکتایەتی هەقیقەت دەبێت و خۆیشی لە مامڵەکردن لەگەڵ هەقیقەتدا دەسازێنێ، بەوپێیەی پرسێکی ڕێژەییە و پەیوەستە بەهەردوو مەبەست - کۆمەڵگەو رۆشنبیریی- بەڵام سێیەمیان گیلنەر بەئەقڵانیەتی رۆشنگەریی ناوی دەبات، :ە کرۆکی بیرۆکەکە بریتیە لە بوونی یەك تاکە هەقیقەت، بەڵام هەر کۆمەڵگایەك بتوانێ تا هەتایە ئەمە زەوت بکات، ئەوە ئەو( واتە گیلنەر) ئەمە رەتدەکاتەوە.

بژارەی یەکەم _ فەندەمینتالیزمی ئایینی _ هێزێکی تایبەتی هەیە لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، چوون گیلنەر بەدوای هۆکارە شاراوەکانی دادەگەڕێت، بۆوەی ڕاڤەکردنێك بخاتە بەردەست لەپەیوەندی نێوان رۆشنبیریی باڵا و رۆشنبیریی نزمی میللی لەنێو کۆمەڵگا ئیسلامییەکان، چوون ئەو ڕۆشنبیرییە جیهانییەی ئێستا، کە پێشتر دەستکەوتێکی کەمینەیی بوو، رۆشنبیری باوە لەگشت کۆمەڵگەدا، بەڵام ئەو ڕۆشنبیرییە باڵایەش، رۆڵێکی ئاوا لەنێو کۆمەڵگا ئیسلامییەکان دەگێڕێ زۆر بەو رۆڵە دەچێت، کە نەتەوەکان لەپارچەکانی دیکە دەیگێڕن.

بژارەی دووەم _ ڕێژەگەرایی _یە لە خۆرئاوا لە بزووتنەوەی پۆست مۆدێرنیزم خۆی دەنوێنێ، کە گیلنەر زۆر بەتوندی رەخنەی لێدەگرێ لەرووی بەڵگەی نقوومبوونی لە(سەبگێکتیڤیزم- زاتانیەت)، بەوپێیەی شێوازێکە لە لێبوردەیی لەگوناهەکانی کۆلۆنیالیزم.



لە راستیدا، کۆششەکانی کۆمەڵناسی بەدوای خواست و مەبەستی (ئۆبگێکتیڤیزم-مەوزوعیەت ) بەوپێیەی مەبەستێکی ئایدیالیستیە - لەمیانی قۆناغی کۆلۆنیالیزمی، تەنیا ئامرازو هۆیە بۆ زاڵبوون، لەکاتێکا ڕێژەگەرایی - خودگەرایی رێگەی خۆلێ رزگارکردن بوو، گیلنەر شوێن پێی هێزو خاڵە لاوازەکان لەبژارەی سێیەم، دەدۆزێتەوە، کە لای ئەو هەرە چاکترینیانە لەرووی بونیاتەوە، بەسەلماندنی ئەوەی ئەو لەسەر بنەمای گریمانەی هەبوونی یەکلاکردنەوەیەکی ناوەکی شاراوەو جیابوونەوەی هەقیقەت کارناکات، کە بەهەند هەڵدەگیرێ لەو هەقیقەتە بەکارخراوە، وەکو جۆرێك لە پێکهاتەکەلچەرییەکان .

ئەو کتێبەی گیلنەر بەگشتی لەرووی مەعریفی و هۆو هاندەرە ورووژێنەرەکان، بریتییە لە پشکدارییەکی گرنگ لە زێدەکردنی تێگەیشتنمان بۆ نوێخوازی _ "پۆستێرن"دوایی _ و ئەو پەیوەندییەی نێوان ئیسلام و خۆرئاوا، هەروەها مایەی بایەخێکی زۆریشە لای هەرکەسێ مەبەستی باری ئایدۆلۆجیای کۆمەڵگای هاوچەرخ بێت.

# پێشەکی

لە بنەڕەتدا مەبەست لەم کتێبە ئەوەبوو بەشێکی کتێبێکی دوو بەشی بەقەوارەتر بێت، بەشەکەی دیکەش لەلایەن موسوڵمانێکەوە بنووسرێت، کەوا بە بڕواو بە کردەوە وابەستەیە بە ئاینەکەی، کە ئەویش پرۆفیسۆر ئەکبەر ئەحمەدە، زۆر لە مێژە ئاگاداری چالاکییەکانی پرۆفیسۆر ئەحمەدم، بەهۆی گرنگیدانی هاوبەشمان بەرێکخستنی خێڵایەتی لە ئیسلامدا. ئینجا پڕۆژەی کتێبەکە لەوەوە بۆ من هات و بڵاوکراوەکانیش پشتڕاستیان کردەوە، دوای ئەوەی بەپێی پێداویستییەکانی گرێبەندێك ئەنجامدرا گۆشەنیگایەك بۆ ئەو دانراوە تێکەڵە بەرجەستە دەکات.

ئەو داوایەم پەسەند کرد لەبەر چەند هۆیەکی جیاواز، لەوانەیە ئەو ڕایەی دەڵێ لەو کارە چاکانە وەدەرخستنی توانستی بەیەکگەیشتنی ئیمانداریکی راستەقینەی پابەند بوو لەگەڵ هزرڤانێکی لایەنگری بنەمای گومان و رۆشنگەرییە لەنێو دووتوێی یەك کتێبدا، کە تارادەیەك هەمان بابەت، بەرێکەیەکی دۆستانە، ناوتووێ دەکەن، کە زۆرێك لە موحیبەت و خۆشەویستی تیایە، بەڵکە ئەوە نموونەیەکی باشە و دەکرێ پەیرەوبکرێت .

مەبەستم لەو بەڵگانەی هێناومەتەوە بریتییە لەوەسف و شیکردنەوەی حاڵەتی سێ رەهەندی، کە لەجیهانی هاوچەرخدا سەرچاوە دەگرێ، شانبەشانی هەرسێ هەڵوێستە بنەڕەتییەکان: بناوانگەریەتی، کە باوەڕ بەتاکایەتی هەقیقەت دێنێ و بڕوایشی وایە کە خاوەنیەتی. ڕێژەگەرایی، کە رستەیەکی هەمەرەنگ لە شێواز دەگرتە خۆو بیرۆکەی یەکتاکی هەقیقەت رەتدەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدات مامەڵەی تایبەت لەگەڵ هەر دیدێك بکات و هەروەکو بڵێی راست بێت. ئینجا ئەو هەڵوێستەی تارادەیەك لایەنگری دەکەم، ئەوەیە کەوا لە رووی یەکتاکی



هەقیقەت ئیمان وەك خۆی دەهێڵێتەوە، وەلێ بڕواناهێنێ بەوەی ئێمە دەتوانین تاهەتایەو لەهەرکاتێك بمانەوێ خاوەنی بین، ئەو هەڵوێستە هیچ ئیمانێکی بڕواهێنی گەوهەری بەکارناهێنێ وەکو ڕێسایەك کە رەوشتێکی کردەوەیی و توێژەرەوەیی دەخاتەڕوو، بەڵکە تەنیا جۆرێکە لە "لایەنگری _ وەلا _" بۆهەندێ ڕێسای دیاریکراوی کارڕایی.

واپێدەچێ ئەو سێ ئایدیۆلۆجیا سەرەکیانەبن، کە رکابەری یەکدی لەسەر پەلکێشکردنمان لەرووی فیکرەوە دەکەن، گەریش دوو نمایندەی دوو لەوانە، وێڕای جیاوازی پێشینەی بەهێزی هەریەکێکیان لەویدیکە، توانیان لەیەك کتێب بەیەکبگەن، ئا ئەمەیان بەم شێوەیە کارێکی چاکە، من دەزانم، یا رەنگەبزانم، بە نزیکەیی، هەڵوێستی پرۆفیسۆر ئەحمەد، وێڕای ئەوەی ئەو دەقەی نووسیویەتی نەمخوێندۆتەوە، هەروەك چۆن هانم نەداوە دەقەکەی منیش بخوێنێتەوە، چونکە ئەمە لەسۆنگەی جیاوازکارییەوە جۆرێك لەپاشگەزبوونەوەی یاخیئامێز دەخاتەوە، کە بێکۆتاییە لە رووی کارتێکردنی پرۆسەی ئاڵوگۆڕکراویدا .

کاتێ هەردوو دەق گەیشتنە بڵاوکەرەوان، رای بڕیاردەرەکان ئەوەبوو کەوا چاکترە بەجودا بڵاوبکرێنەوە، من و پرۆفیسۆر ئەحمەدیش ئەو بڕیارەمان پەسەند کرد، وێڕای ئەوەی بەپێچەوانەی مەرجەکانی ئەو گرێبەندییە بوو، کە دەقەکانی بەگوێرە نووسرابوو، لەگەڵ ئەوەی من زۆر گوێ نادەمە وردودرشتی ئەم شێوازە، کە بەهۆیەوە بیروڕاکانم دەگەنە جەماوەری خوێنەران جا هەرچییەك بن، ئەوە وێڕای هەرشتێ هەر خودی بیروڕاکانن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ویستم هەموو ئەو شتانەی لە بارەی بنەمای ئەو دەقە وتوومە بیڵێم، تاوەکو هەندێ ڕووی ئەو بیروڕایانە، کە بەپێی هەموو گریمانەکان جیاوازە، شلۆڤە بکەم، گەربێ و پێشتر زانیبێتم، کە من تەنیا کتێب دەنووسم و نەك بەشێك، کە نیوەی دانراوێکی هاوبەشە. ئەمەش مانای ئەوەنییە کەوا من دەمەوێ شتێکی جیاواز بڵێم، بەڵام بەلایەنی کەم دەمویست ئەو شتەی دەمەوێ بیڵێم بە ڕێگایەکی جیاواز بێت، بەڵام خوێنەران، ئەوانەی بەتاسەوەن بۆ بینینی

هەردوو ریوایەت دەتوانن هەردوو کتێب بخوێننەوە (بڕوانە ئەکبەر. س. ئەحمەد، پۆست مۆدێرنیزم و ئیسلام، لەندەن، روتلدج، ١٩٩٢) لەمیانەی کارکردنم لەسەر ئەو دەقە، کۆمەکییەك کرام نارخێندرێت، سەرەرای پیشتیوانی مەعنەوی لەلایەن کاربەدەستەکانی نووسینگەی بەشی ئەنترۆپۆلۆجیای کۆمەڵایەتی (کامبردج)، ئەوکات لە خاتوو ماری ماکگینلی و خاتوو مارگریت ستوری، و خاتوو ئان فاجەرو همفری هینتون پێکهاتبوون، هەروەها خاتوو سارا گرین پترو کاریگەرانەتر هاریکاریی کردم، بەڵام داڤیدی کوڕم هەر زوو یەکەمین دانەی خوێندەوەو وەك ئادەتی خۆی پێشنیازی زۆر بەسوودی نووسی و زۆریشیانم ڕەچاو کرد، توانیشم بەهۆی بەخشینە پێشکەشکراوەکانی هەریەك لەئەنجوومەنی توێژینەوە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و دەزگای نوفیلد، یارمەتییە تەکنیکییەکان دەستەبەر بکەم، هەروەها سوپاسی جوشن دایر دەکەم، کە دەستنووسەکەی ئامادە کردو چاپی کرد، سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم، کەناوم بردن، لەوانیش کەناوم نەبردن، بەو پێیەی، بەهۆی سروشتی هەستەوەری بە ئەگەری هەندێ بابەتی پێشکەشکراو، ئەوە پێویستە دووبارە بڕیار بدرێ لەسەرئەوەی ئەو بیروڕایانەی لەو کتێبەدا گوزارشتیان لێکراوە. ئەگەر بەهاوبایەخیشیان هەر چەندێك بێت، ئەوە تەنیاو تەنیا تایبەتن بەخۆم.

**ئەرنست گیلنەر**



## پۆست مۆدێرنیزم و ئەقڵ و ئایین

لەمێژووی مرۆڤایەتیدا حەزوخولیایەکی پێشوەختە هەیە لەرووی ململانێیە هزرییە سەرەکیەکان بەجۆرێك هەریەك لەو ئاراستە هزریانە تەکان پێدەدات بۆ قالبڕێژیی لە بۆتەی دوالیزمێکی دژدا، کێشە گەورەکان هەمیشە دەبنە هۆی پەلکێشکردنی رەگەزی مرۆیی، لەشەڕە ئایینیەکان، کاسۆلیکەکان رووبەڕووی پرۆتستانتەکان بوونەوە، دوایش ئیمانی ئایینی هەر ئەو بوو بەرەنگاری لۆجیکی ئەقڵی بوویەوە، ئینجا رکابەری لیبرالی سۆسیالیزمی لەسەدەکانی داهاتوودا کرد. کەرتخوازییە ناسەرەکییەکان؛ هەڵبەت هاوپەیمانییەتێکی ئەوتۆیان ساز دەکرد هێڵی دابەشبەندییە گەورەکانی کونبەدەر دەکرد، لەکاتێکا هەلپەرستی سیاسی دەگا بە توندوتۆڵترین وابەستەکاریی ناوێزەو سەیرو سەمەرە، بەمەش، شێوەکانی لایەنگیریەتی ئایینزایی و سیاسی بۆ ئەو لایەنە یا ئەوی دیکە لەڕووی تەکتیکییەوە زۆر ئاڵۆز دەکەوێتەوە، وەلێ بەگشتی، یەك کێشەی مەرکەزی رووەو زاڵیەتی بەسەر تێکڕای بارودۆخەکەوە، وەڕسورا.

بەڵام ئەوەی تایبەتە بە لایەنەکان ئیمانی باوەڕداریێتی، پێدەچێ دیمەنی هاوچەرخمان وەکو بلێی چیدی جووت جەمسەری نەبێ، چوون لێرەدا سێ نەك دوو ئایدیۆلۆجیای رکابەرمان هەن، سێ هەڵوێستی گەوهەری ناکرێ بسڕێنەوە، لابرێن، سێ رەنگی سەرەکی بەرمەبەست بۆ کێشانی سکێچی نەخشەی ئەو بارودۆخەی دەیگوزەرێنین، زۆریش هەڵەیە هەولبدرێ هەرکامێکیان لاببرێ، یا کورتبکرێتەوە بۆ تەنیا زێدەڕۆیی فرەوێژی یا هەر راستکردنەوەیەکی سازان ئامێز بۆ هەریەکێك لەودوانەی دیکە، یا دیتنیان وەکو شێوازێکی چارەی مامناوەندی نێوانیان، چوون هەریەك لەوانە گوزارش لە بژارەیەکی گەوهەری رۆحی مرۆڤایەتی دەکات، کاتێ جیهان رووبەڕووی ئەوەی ئێستا تیایەتی دەبێتەوە.

واپێدەچێ هەرسێ گەورە هەڵوێست، وەکو ئەوەی بڵێی تارادەیەك هەمان ئەندازە هەرسێکیان لەیەکدی دووربن. بەمەش تارادەیەك بارێك لەهاوسەنگی لەو یەکسانییە دوورەدەستەی نێوانیان قووت دەبێتەوە هەر جووتێ لەوسێیانە دووجەمسەریان لەهەندێ بنەمای دیاروبەرچاودا پشکدارن، بەڵام نەك تا ئەو ئەندازەیەی بکارێ پەیوەستییەکی تایبەت و باو بۆ یەکگرتنیان بخولقێنێ، یا لێکدوورکەوتنەوەیەکی شاراوەی تایبەت لێکدیان جیابکاتەوە، هەروەك سارتەر لەدەرگا کلۆم دراوەکان، دەڵێت: بارودۆخی گرژوناجێگیر بەشێوەیەك وەکویەك-یەکسان- نزیکەیی هاوسەنگە و نەگونجان و لەقی تێیدا بنداکوتاوە و هیچ یەك لەو هاوبەندییە رێتێچوانەش لەویدیکە زێدە سروشتی ترو گرنگتر نییە، وێڕای رسکانی هاوپەیمانێتیەکان، وەلێ بارگرژیەتی ناوەکی و ئەو بەدبینیانەی ناکرێ دەستبەرداری بن، بەشێوەیەکی حەتمی هاندەری دووبارە کێشانی هێڵەکانی هاوپەیمانێتیەکانن، بەجۆرێك مەحاڵە هەر بەشداربوویەك بتوانێ لە جێگیریەکی کردەنی دابێت لەنێو ئەو وابەستەگییە توندو تۆڵەی خودی پێوەندبارییەدا، کارێکە تارادەیەك بەیاری مەقەست و کاغەزو بەرد دەچێت، کە منالان یاری پێدەکەن، مقەست کاغەزەکە دەبڕێ، کاغەزیش بەردەکە دەپێچێتەوەو بەردەکەش مقەستەکە کول دەکات، لێرەدا زاڵبوونێکی جێگیرانە نییە، بەتاکە حاڵەتێکی بنجداکوتاو لە بزواوی و ناجێگیریی.

ئەوسێ ئایدیۆلۆجیا رکابەرانە چین؟

١- فەندەمینتالیزمی ئایینی.

٢- رێژەگەرایی، کە لەتەرزی ئێستا لە "پۆست مۆدێرنیزم" خۆی دەبینێتەوە.

٣- ئەقلانیەتی رۆشنگەریی یا فەندەمینتالیزمی ئەقلانی.

هەرسێ دەستەواژە بەبێ بڕیاری پێشوەختەی لایەنگیریکردن بەکاردێن: ناوەکان بەسادەیی زاراوەگەلی شفرەیین لەو هێمایانەی مەبەست لێیان تەنیاوتەنیا دیاریکردنی هیچ کێشەیەك نییە، بەڵکە ئەوە مەبەست و مانایان لەواتاکانی دەداتە دەست، تەنیا لەمیانەی رێرەوی گفتوگۆدا، بەدیاردەکەوێت.



## فەندەمینتالیزمی ئایینی

ئەوبیرۆکەیە یائەو هەڵوێستەی پەیوەستە بەو زاراوەیە روونن و هیچ کەموکوڕییەکیان نییە، باوەڕگەرێتی یا راستەڕێ((**الاستقامة الصراطية**)) (بەفەرەنسی Integrisme) ئەمانیش دوو ناو دەخەنە ڕوو ئاماژە بەهەمان دیاردە دەدەن، بەڵام بیرۆکەی بنەڕەتی ئاماژە دەدا بە هەبوونی پشتگیریی و لایەنگیریی بیروبڕوای ئیمادارانە لەرووی هێزوتوندوتۆڵیەکەی لەمەڕ فۆرمەڵەکردنە تەواو حەرفیەکەی، ترازاو لە کۆتوبەندی چارەسەرێکی مامناوەندیانە یا میانڕەویەتی یا دووبارە کردنەوەی راڤەکردن - تەفسیر — یا کەموکوڕی، هەروەها هاوکات پێویست بەوەش دەکات بەوپێیەی ناوەڕۆکی ئایین ئەقیدەییە نەك داوونەریتی تقوس ئامێز، ئەوە ئەو ئەقیدەیەش بکرێ بەهێزوپتەوانە و بەشێوەیەکی تاهەتایی، قایم ورەگداکوتاو بێت، بەجۆرێك هاوکات لەگەڵیا پێویستی بەنووسینەوە بێت.

دەکرێ لەرێی زانینی ئەوەی نکوڵی لێدەکات زۆر چاکتر لە بناوانگرێتی بگەیت، ئەمیش ئەو بیرۆکە بەربڵاوە نوێیە رەتدەکاتەوە، کەدەڵێ ئایین وێرای ئەوەی جۆرێك لەدەسەڵاتی شەرعی پەنهان تایبەت بەخۆی هەیە، بەهەق ئەوەی مەبەستیەتی دەیڵێ، بەڵام پراکتیزەی ناکات، هەروەها هەڵبەت بەلای ئەو فامکردنی رابردوو لەلای هەموانەوە دیاردەیەکی سروشتییە، ئەوەی بەهەق مەبەستیەتی بەگوێرەی ئەو نوێخوازییە رەتکراوەیە، بە کارێکی تەواو جیاواز لەقەڵەم دەدرێت - کارێك لەکۆتایدا سەلمێنرا، کە لە رەگ و ریشاڵەوە جیاوازو وێکنەچووە لەگەڵ ئەوەی پێڕەوکارە سادەو ساکارەکانی پێشوو تێی گەیشتوون بەجۆرێك زۆر ئەولاتریش لەو راڤەکردنە سروشتییەی خواست و داخوازییەکانی ئیمانی گۆرین - مەبەست-.

بناوانگرێتیی ئەو بانگهێشتە لێبووردەییە نوێباوە، رەتدەکاتەوە، کە دەڵێ: ئیمان واتە کارێکی کەمتر توندو کەمتر دەست بژێرانە و بەزەبر، بەگشتی و زێدە توانا

دارتــرە بــۆ خۆگونجــان و ســازان، ســەرەرای تــین و توانــای هــاوکوفی و هاوســازی و خۆگونجاندن لەگەڵ گشت ئایینزاکانی دیکە، تەنانەت، یانەخاسمە بـێ ئیمـانیش، ئـەو جۆرە نوێخوازییە گشت داواکارییـەکانی و پێـشبڕییەکانی و بەگژاچـوونەوەکانی، لـە ئەقیدەو سروشتەکەی، سەرچاوەی گرتووە.

یەکێك لەوسەرچاوە سەرەکییانەی ئەو کولتوورە نوێباوە، سۆرین کیرکگاردە، ئـەو نووسەرە دانیمارکی و لاهوتیـەی لەسـەدەی نۆزدەهەمـدا بەشـۆرەت بـوو، ئـەو بـەو بیرۆکەیەوە بەندە، کە دەڵێ: ناوەڕۆکی ئایین رەزامەندی و قایلبوون نییە بەهەقیقـەتی ئەقیدە، بەڵکـە پابەندبوونێکـە بەهەڵوێـستێك عەبەسـیەت - بێهـودەیی — تیایـە بنجداکوتاوە، کە بەپێی گوزارشتی ئەو دەبێتە هۆی جۆرێك لە نـەنگی و سـووکایەتی پێکردن [1]، هەروەك دەڵێ، ئێمە شوناسمان لەمیانەی بڕواهێنان بەشـتێ وەردەگـرین، کە بەتوندی ئەقڵمان ئەتك دەکات، هەر ئەمەش وا لـەوکارە دەکـات بەپلەیـەکی زۆر گـەورە ئەسـتەم و دژوار بکەوێتـە بەردەسـت ودیـدە، بـۆ ئـەوەیش هـەبین پێویـستە لەسەرمان باوەڕ بێنین، باوەڕ بەشـتێك بێـنین بەشـێوەیەکی تۆقێنەرکـە ئەستەمیـشە لەهەمان کاتدا بڕوای پێ بێنین، چوون ناکرێ هەبیت بەهۆی تەنیا باوەڕکردن بەشـتێك ماقووڵ و پەسەندکراو و شایستەی باوەڕپێکردن بێت، بەس ئائەمەیە ئەو وەرچەرخانە وجودییەی ئیمان بەشوناس دەبەستێتەوە نەك بەبەڵگەی سەلمێنەر.

بەڵام وریابە، چوون لەژێر رووکـاری ئەوخواسـتە بـەهێزەدا پاسـاوێکی شـیاندراو حەشاردراوە بۆ رەخساندنی ئاسانکارییەکی زۆرو زەوەند.

جا گەرهاتوو ئائەمە ئایین بێت و گەریش پابەند بوون ناوەڕۆکـە گرنگەکەیـەتی و هەمموو جۆرە پابەندبووەکانیش وەکو یەکن، ئەوە لێرەدا پێویستییەکی زێـدە لـەئارادا نییە - زەروورەتێکـی سـەربارنییە - بـۆوەی مـرۆ نیگـەران بکـات، بەهـەق هـەر ئاستەنگێکی لۆجیکیانە پەیوەسـتە بـە کرۆکـی ئـەو هەڵوێـستەی پێـوەی پابەنـدە، نیگەرانی واتە مرۆ ئاوێتەیەك بخاتە روو لەنێوان پابەندبوون بەشوناس و قایلبوونی بـە بەڵگە (ئەمەش کاری نەکردەیە) کەواتە، هەمموو شـتێ سـاغ و دروسـت رێـدەکات و



گشت بارگرژییەکانی بارودۆخەکەش دەپووکێنەوە، ئەمـەش هەڵوێـستی نوێکارانـەی دیاروبەرچاوە، بەڵام لێرەدا چەندین شێوازی فرە جۆر هەن. چوون دەکرێ ئیمان ببینین، نەك بەوپێیەی پابەندبوونە، بەڵکە لەو ئاهەنگانەی کۆمەڵگای لۆکـاڵ خـۆ دەنوێنـێ، دووپات کردن و دڵنیا بوونەوە لە غەیبییەت تا جیفـرەی هێماکـان سـاغ بکاتـەوە بـۆ گـوزارش کـردن لـە لایەنگیریـەتی بـۆ سیـستەمی کۆمەڵایـەتی و بەهاکـەی، ئـەو ئەقیدەیەش، کە جیفـرە هێماییـەکی شـیدەکرێتەوە بـەهۆی ئـەو هێڵانـە بـەو شـکە گوماندارییە (الريبي) هەر نەتەنراوە. لەڕاستیدا چ ئەقیدەیەك لەئارادا نییـە، بەڵکـە تەنیا ئەندامێتییە لەبەر هۆیەك لەهۆیەکان ئەو شێوازە ئەقیدەییـە تـەوزیف دەکـات وەکو فشارێکی هێمایی بۆی.

سـەرهەڵدانی هـەر ئیمـانێکی ئـایینی، بـەپێی ئـەو ئاراسـتە سـاناکارییانەی نوێکارییەتی، کە دووبارە راڤەی دەکاتەوە، لە واقیعدا ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا ناکـات بەوپێیەی هەقیقەتێکی حەرفیە، بەڵکە تەنیا شێوازێکە لەنموونە گـەلی رەمـزی، کـە هەقیقەتە ((هێما)) ییەکان دەگوازێتەوە، پرسێکە نـاکرێ بـەمانا رووالەتیانییەکـەی وەربگیرێ، بەمەش ناکەوێتە نێو چاڵی هیچ جۆرێ لەو دژایەتیەی ململانە لەگەڵ ئـەو ڕا زانستیانەی لەبارەی ئەوەی لەسەر رووکاردا بەرچاو دەکەوێ و واپێدەچێ هـەروەکو بلێی هەمان بابەت بێ.

بۆ نموونە ناتەبایی نێوان کتێبی (سفر التكوين ) لەلایـەك و داروینیـزم و فیزیـای گەردوونی نوێ لەلایەکی دیکەوە چ نیگەرانییەکی ئەوتۆ بۆ ئیماندارانی ((نوێگەران)) نانێتەوە، ئەوان گریمانە دەکەن ڕایە زانستییەکان و ئـایینزا ئایینییـەکان، وێـڕای وەك پێدەچێ هەمان رووداو تاوتۆ بکەن — خولقاندنی جیهان و رەچەڵەکی ئادەمیزاد — لە راستیدا بەسەر ئاستە تەواو جیاوازەکان دادەکەون، تەنانەت هەروەك هەنـدێك پێیـان وایە، بەگشتی بەزمانی جیاواز گوزارش لەهەریـەکێکیان کـراوە، لەچوارچـێوەیەکی جودا لە ((گوتار)). بەشێوەیەکی گشتی ئەو ئایینزاو خواسـتە ئەخلاقییانـەی ئیمـان وەردەچەرخێنرێن بۆ شتێکی سەرسـوڕهێنەر لـەرووی ناتـەبابوونی لەگـەڵ حیکمـەتی

سەردەمی عیلمانییەت ئەگەرهاتوو بەرێگەیەکی گونجاو و لەبار راڤەکرا، بەڵکە تەنانەت لەگەڵ هەرپرسێکی دیکە لەواقیعدا، ئەو ڕێگەیەش بەسەرچاوەی ئاشتی و — بۆشایی (ڤالایی) ئەقیدەیی دادەنرێت.

فەندەمینتالیزم موکوڕانە نکوڵی لەو شێوازەی لاوازکردنی ئاسەواری خواستە ئایینییەکان دەکات و بزووتنەوە بناوانگرەکانیش لەچەندین ئایینەوە سەرهەڵدەدەن، وێڕای ئەوەی هەر هەموویان بەهەمان ئەندازە چالاك و بەهێز نین، لەوسەردەمەی ئێستاماندا، بناوانگریەتی ئەوپەری هێزی خۆی لە ئیسلامدا دەبینێتەوە، لەبەرئەوەش چاوگەی بەڵگەو بیانووەکان، کە پێشکەشیان دەکەین تەرکیز دەکەنە سەر ئیسلام.

جیهانی ئیسلام، وێنەیەکی ئەوتۆ لەجیهانی نوێ پێشکەش دەکات، مایەی گرنگی و بایەخدانە. زانایانی کۆمەڵناسی زۆریان بیر لە تیۆری عەلمانییەت کردۆتەوە، و جارەهای جار پەسەندیان کردووە، تیۆرەکەش بەم رێچکەیەدا رێدەکات: لەکۆمەڵگای پیشەسازی — زانستی، ئیمان لاواز دەبێ و پەیرەوکردنی داو ونەریتە ئایینییەکان سووك دەبێ، مرۆ دەتوانێ هۆی هزری بۆ ئەمە بخاتە ڕوو:

ئەقیدەکانی ئایین مل وەبەر بنەماکانی زانستەوە دەنێن، کە بەدەوری خۆیان پێگەیەکی گەورەیان هەیەو رێساو بناخەگەلی تەکنیکاریەتی نوێ پێکدێنن، بەمەش ئابووری نوێ پێکدێ، لەبەر ئەوە، ئیمانی ئایینی کزدەبێ و جێگەو شانوشکۆی لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەپایەو هەژموونی رکابەرەکەی، شکست دێنێ.

هەروەها دەکرێ مرۆ خودی ئەو هۆیە بونیاتگەرییانە دەست نیشان بکات: ئایین پەیوەستە بەرێورەسمە ئاهەنگ ئامێزەکانی کۆمەڵگای لۆکال و لە جیهانی پەرش و بڵاوی کۆمەڵگای نوێی جەماوەری، تەنیا کەمێك لەو دابەشبەندە هاوبەشانە هەن، کە دەکرێ کۆمەڵگای خۆماڵی پێوەی بنازێ و بایەخی پێ بدا، جگە لەوەی پەیوەستە بەدەوڵەتی نەتەوایەتی — ئەو دەوڵەتەش، رێورەسمی کەشی تازەو رستێك بەهای تایبەت بەخۆی لە بیرۆکەی نەتەوایەتی، بەدیکرد، کەواتە، داخورانی ژیانی کۆمەڵایەتی لەونبوونی ئیمان رەنگدەداتەوە، هەروەها لەلاوازیی جەزبەی کەشە داوونەریتەییەکان.



لێرەدا چەندین هەمە جۆرایەتی جیاواز لەرووی ئەو تیۆرەوە هەن، گرنگیەکەش لەوەدایە تێزی عەلمانیەت بەشێوەیەکی گشتی خۆراگرە، هەندێ سیستەمی سیاسی بەشێوەیەکی رووقایمانە بەو ئایدیۆلۆجیا عەلمانییانەی کە دژ بە ئایینە بەستراونەتەوە، هەندێکی دیکە بەشێوەیەکی فەرمی خۆی لەئایین جیادەکاتەوەو عەلمانییەت لەرێی پشت گوێ خستنی و ونبوونی زێتر لەجەخت کردنە سەرکارکردن لێی، پێڕەوو پیادە دەکات، بەڵام بەشێوەیەکی فەرمی تەنیا چەند دەوڵەتێکی کەم نەبێت، بەئایینەوە پەیوەست نابن، گەریش بوو، ئەوە وابەستییەکە سست وشلوخاوەو زۆریش بەهەند ناگیرێ، هەروەك چۆن ئاستی پەیرەوکردنی رێورەسم و بەشداریکردنی ئایینی نزمە، کاتێکیش پلەکەی بەرز دەبێتەوە، ئایین لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ناوەڕۆکێکی کۆمەڵایەتی واقیعی دەبێ، نەك غەیبی شکۆییانە: چوون ئەقیدەی فەرمی فەرامۆش دەکرێ و مامەڵەش لەگەڵ بەشداریکردن بەوجۆرەیە کە ئاهەنگێکە بۆ کۆمەڵگای خۆماڵی نەك ئیمانی ئایینی. بەدەگمەن کێشە ئایینییەکان قووت دەبنەوە، کاتێکیش کۆمەڵگای خۆماڵی نەوەی خۆی دەپارێزێ، وا دیارە بەنزیکەیش وای پێ چاکترە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بە هۆیبۆنەکانیەوە ئاهەنگ بگێڕێ نەك لەمیانی یا لەرووی روانگەیەکی ئایینییەوە.

لەمیانی قۆناغی سەرهەڵدانی ئایینەکان لەجیهاندا، چاوخستنە سەر کەشە زیندووە داوونەریتەییەکان وەرچەرخا بۆ ئەقیدەی غەیبی شکۆییانە، وەکو بڵێی ئێستا چەرخەکە خولێکی تەواو خولایەوە، کاتێکیش ئایین هەندێ چالاکی و هێزی وەخۆگرتووە، ئەوە چالاکانە ترو بەهێزترە کاتێ جارێکی تر دەبتە - مەدەنیانەی دنیاییانە - بۆ نموونە لە ئەمریکای باکوور، ئاستی کۆی ئامادەبوونی رێورەسم و تقوسە ئایینیەکان بەرزە، بەڵام ئایین تەنیا رۆڵی پەرەستنێتی هاوبەش لە شێوازی ژیانی ئەمریکایی دەبینێ و ئەوانیش زۆر بەتوندی پێداناگرن لەسەر جیاوازکاریی لاهووتی یا رێکخستنەکانی کلێسە، هەروەك ئەوەی کەوا لە رابردوودا دەکرا(٢)، بەڵام سەبارەت بەو هەڵاوێردنە روونانە بۆ مەیلداری رووەو عەلمانیەت، ئەوە لەدووماهیدا

بەپێی ئەو توێژینەوەو ئەنجامگیرییە سەلمێندرا کە ئەمە حاڵەتی تایبەتن و قابیلی راڤەکردنن لەمیانەی هەلومەرجێکی دیاریکراو، هەروەکو کاتێك رووددات کەوا کلێسە وەکو دەزگایەکی بەرهەڵستکاری دەوڵەتی سەرکوتکەر بەکاردەخرێت، کە پابەندبوو بەسیستەمێکی بڕواهێنی عەلمانی و دەشکرێ کۆك نەبن لەسەر مەودا یا گونجان یا هەڵنەوەشاندنەوەی ئەو مەبەست وخولیایە [٣]، بەراستی و بەبێ گومان سەرەڕای ئەوەی چەندین فۆرمی تەواو جیاواز بەخۆوە دەگرێ، بەڵام بەگشتی وادیارە لۆجیکیانەشە گەر بڵێین عەلمانیەت هەقیقەتێکی واقعیە.

وەلێ لێرەدا هەلاوێردنێکی واقیعی کاریگەرو دیار هەیە بۆ ئەمانە: کە ئیسلامە، کاتێکیش دەگوترێ بلاوبوونەوەی عەلمانییەت لە ئیسلامدا مایەی ململانە و گفتوگۆ نییە، ئەوە بەسانایی هەر لەبنەڕەتەوە کارێکی قەڵپ و ساختەیە، ئیسلام ئەمڕۆ هەروەکو چۆن بەرلەسەدەیەك وابوو، بەهێزە، بەڵکە لەهەندێ روو ولایەندا بەهێزترە[٤].

لەسەروبەندی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، جیهانی کۆن بریتی بوو لە چوار شارستانی گەورە، ئەمڕۆ سییانیان عەلمانینە، بەپێی ئەو پێوەرەش یا ئەویدیکە، ئەقیدەی کریستیانی لەلایەن خودی لاهووتییە کریستیانییەکان دووچاری هەموارکردن و بژارکردن بوویەوەو بڕواهێنانێکی سەددەرسەدوقووڵی ئیمانداریی لەحزووریدا روون یا دیارو بەرچاو نییە [٥] لەجیهانی چین دا جۆرێك لەبڕواهێنانی قووڵی ئیمانداریی بەشێوەیەکی فەرمی چەسپا، دوای ئەوەی لە دەست شێوە پێشینە ئایینییەکانی قورتاری بوو. لەجیهانی هیندا، دەوڵە ت و توێژی دەستە بژێر هەڵوێستی بێلایەن، لە ئاست هەرچییەکی کە بە دینی باوی گەل دابنرێت، وەردەگرن، تەنانەت گەرهەندێ رێوشوێنیش هەر بەردەوام بوون لەبەربلاوی وتەشەنەکردن وەکو ئەستێرە ناسی. بەڵام تەنیا یەکێك لەوچوار شارستانییەتییانە، شارستانێتی ئیسلامییە، کەوا حاڵەتێکی تەواو جیاوازە.

لەبەرچی بەتەنیا یەك ئایین لەو پلە سەرنجراکێشەیە لەرووی بەگژاچوونەوەی عەلمانییەت؟ پرسیارێکی فرە گرنگە. منیش نازانم ئاخۆ ئەو وەلامەی دەیخاتە ڕوو،



وەلامە راستەکەیە، هەروەها گومانیش لە ئاستی توانای زانینی هەر کەسێکی دیکەش دەکەم. تەفسیراتە مێژووییەکان بەئاسانی ناسەلمێندرێن و ئەوەی بوویش لەهەرە چاکترینیانە، کە بتوانم پێشکەشی بکەم و شتێکیش لەرۆشنایی دەستەبەر دەکات، وێرای ئەوەی داخوا تێکڕای هەقیقەت دەگرتە خۆی یاخود نا، گەریش تیۆرێکی جێگرەوە چاکتر هاندەربوو، ئەوە من بەتەواوەتی رازیدەبم.

ئیسلام ئایینی دامەزرێنەرە، وای دەردەخات کەوا بەشێوەیەکی تاهەتایە تەواوکەرو کۆتاهێنەری کولتوریی ئیبراهیمی و پێغەمبەرانە، محەمەد دوایین پێغەمبەرە، بەڵام هەردوو کتێبی پیرۆزی پێشوو، ئەوانەی وەحی ئاسمانیان بۆ هەردوو پێغەمبەری دیکەی ئایینی ئیبراهیمی دابەزاند، ئەوە مسولْمانەکان بەلادەریان دادەنێن کەوا بەهۆی پێڕەوکارانی هەریەك لەوان هەڵگێردراونەتەوە.

ئیمان پشت دەبەستێ بەو پەیامە ئاسمانییەی لەسەدەی حەوتی زایین بۆ محەمەد پێغەمبەر دابەزی، بەڵام ئەو رووداوانەی لەمیانەی چەند نەوەیەکی کەمی هەوەڵی لەژیانی مسولْمانان (سەرهەڵدانی ئیسلام) بەرپابوون بەشێوەیەکی گەش نووسراونەوەو خرانە بەردەم جەماوەری موسڵمانان و لەهۆش و گۆشیان پاراستیان. ئەمەش ئەو بنەمایانە دەنوێنێ، کە بەهۆیەوە ئیسلام دابەشی سەر سێ تیم بوو: زۆرینەی سوننی و کەمینەی شیعی و خەواریجەکان، خەواریجەکانیش بەژمارە لەهەموویان کەمتر بوون.

بیروبڕواو باوەڕە مەرکەزییەکانی ئیسلام دووپات کردنەوە و قبوولْ کردنێکی یەکلاکەرەوەی بێ مشتومڕی بیرۆکەی تەوحیدە [٦] — یەکتاپەرستی — ئەو رایەش، کە دەڵێ پەیامی دابەزیو بۆ پێغەمبەر محەمەد گەرشیا بڵێین دوماهی و دووایینە و ئیمان و ئەخلاق دەگرێتە خۆ — یا بەوشە گەلی دیکە، لەیەککاتدا ئەقیدەو شەریعەتەو هیچ زێدە خستنەسەری هەقیقەتی ئۆرگینالی دیکەی لاپەسەند نییە، لێرەشدا تایبەتمەندییەکانی ئەقیدەو تایبەتمەندییەکانی شەریعەت لێك ناترازێن، چاکترین وەسفی فەقیهەکانیش لەزانا مسولْمانەکان ئەوەیە بەلاهووتییە فەقیهەکان دابنرێن. هەروەکو یاسای کلێسە نییە، بەڵکە خۆی لەخۆیدا تەنیا شەریعەتی پیرۆز

هەیەو بەسەر کۆمەڵی ئیمانداران، نەك لەسەر ڕێکخستن و ئەندامانی دەزگایەکی تایبەتمەند، پیادە دەکرێ.

بەم ڕێگەیە، هەقیقەتی دەستبەسەر داگرتنی خوداوەندێتی بەسەر تەشریعدا سەبارەت بەژیانی ئیسلامەتی بنج وبناوانی قووڵی خۆی هەیە ، ئەمەش مانای ئەوە نییە بناوانگر تەنیا ڕووبەڕووی ئاستەنگ ببێتەوە لەڕووی پەسەندکردنی یاسای تازەی دانراو و هەڵسوکەوتی یاسادانان، بەڵکە مانای ئەوەشە هەر لەگەڵ بەراییەکانی هەوەڵێن، یا زۆر نزیك لەوبەراییە جۆرێکی دیاریکراو لەجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان وەدیارکەوتووە لەنێو پێکهاتەی کۆمەڵگای ئیسلامی. ئەو شێوازەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانیش پێویستی بە چاوەڕوانکردنی مەزەبێکی ڕۆشنگەریی، پەیوەست بە حەزوخولیاکەی لە سیستەمێکی فرەیی کۆمەڵایەتی، نییە، هەروەها بەو هاوسەنگییە ناوخۆییەی دەزگا سەربەخۆکان، ئەو دەسەڵاتی جێبەجێکردنە دەخاتە ژێر ڕکێفی یاسادانانی — تەشریع — ی (ئیلاهی) و لەپراکتیزەکردنیشدا لاهووتییە یاساناسەکان وەردەچەرخێنێ بۆ چاودێرانی — سیراتییەت — و ڕاستێتی و دروستی سیاسەت قایم و سوسە دەکەن — وێڕای ئەوەی داخوا ئەوانە دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە حوکم و بڕیارەکانیان بخەنە بواری جێبەجێکردنەوە یا نا [7] بەڵام پرەنسیپی ((نەتەوەکەم لەڕێی چەوت یەکانگیر نابێ)) ڕەنگە جۆرێك لەدەسەڵاتی یاسا دانان ببەخشێتە تێکڕایی نەتەوەکە نەك پلەوپایەی ڕامیاریی و لەنێو ئەو گشت کۆمەڵەشدا، دەنگی فیقیهاو زانایان لەبارو شیاون بۆ وەی سەنگێکی تایبەت بەخۆیان هەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا، لەسەر کۆمەڵەی موسوڵمانان پێویستە بایەخ بدەن بەیاسایەك، کە بەکردەنی هەیەو سروشتیشە ڕێز لەڕای ئەوانە بگیرێ کە زێدە تێگەیشتوو و زانستیترن.

کەواتە، هەرهێندە بیرۆکەی یاسای دوماهی و ئیلاهی پەسەندکرا، ئەو یاسایەی لەڕووی بنەماوە هیچ زیادەیەکی چ ئیلاهی یا بەشەری پێ قبووڵ نییە، ئیدی دەسەڵاتی جێبەجێکردن (بەشەری) خۆی لەنێو جەرگەی سروشتی شتەکان بینیەوە جیا لەبازووی فەرمانڕەوایی یاسادانانی (ئیلاهی، بەڵام کۆمەڵی مرۆیی تیاهەن)،



شەریعەتیش لە توانایدا هەیە لە چاکترین بارودۆخ، لەمیانەی پێوانەو تەفسیرو تەئویل، بەرفراوانتر بێت، بەمەش کۆمەڵگە دەستوری بنەڕەتی بناوانگریەتی و یاسای ماددی ژیانی دەبێت، هەریەکێکیان بەرێگەی تایبەتی خۆی پتەو قایمکراوەو قابیلی بەکارهێنانیش لەلایەن ئەندامانی تەبای سەنگی مەحەکی حکومەتی شەرعی، گەرشیا بلێین یاسای دەستوری بەهێز، هەمیشە ئامادەیەو لەچاوەڕوانی گشت شێوەو سیستەمەکانی فەرمانڕەواییدایە. هەروەك چۆن پێوەری شکۆیی وباڵادەستی ڕاستڕۆیی و دروستی لەڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕەخسێنراوەو بەردەوام بەئاسانی دێتە دەست، دوورە لەدەست ئاڵوویری دەسەڵاتی سیاسی و یاری پێکردنی بۆ بەرژەوەندی خۆیی و سانایشە بۆ تۆمەتبارکردنی ئەو دەسەڵاتەی هەیە، گەرهاتوو مافی ئەوی پێشێل کرد یالێی لادا یا خەتاباربوو بەرامبەری. کارەکەش سەبارەت بەوپێوەرە هەر هێندەی گەرەك بوو کەوا هاوپەیمانێکی دنیایی هەبێت، خودان هێزی چەکدار، بۆئەوەی دەسەڵاتی لادەر — گەر وای لە قەڵەمدا — بخاتە نێو تەنگوچەڵەمەیەکی ترسناك، مێژووی سیاسی ئیسلام بە کردەوە دەوری دەرکەوتنی چەند جارەیی ئەو جۆرە هاوپەیمانە چەسپاوەی دەسەڵات لەنێوان — سیراتیەتی — شکۆیی ئایینی و هێزی دنیایی واقیعی، دەخاتە ڕوو [8].

بنەمای دیکەی گرنگ و بایەخدار لەئیسلام لەڕووی تیۆرییەوە خۆی لە ونبوونی چینی پیاوانی ئایین (ئەکلیرۆس) دەبینێتەوە، لێرەدا چ پێگەیەکی پیرۆزی جیاواز نییە بانگەشەکار یا ڕێبەری ئاینی لە داوونەریتەکاندا لەجەماوەری ئیمانداران لەنێو گشت خەڵکی، جوێ بکاتەوە، سروشتیشە کە ئەوانە وامەزندە بکەن کە لەوجۆرە کەسانەن، کە زێدە لێهاتوو شیاو و زانستی و تێگەیشتوو ترن، بەڵام نەوەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی لەجۆرێکی جیاواز بن، هەروەها لەڕووی فەرمییەوە دەزگایەك بۆ پیاوانی ئایین لەئارادا نییە، بەومانایەش سیستەمی لاهووتی ئیسلامی بەیەکسانیەتیەکی تەواو ناسراوە، ئیماندارانیش بەهەمان ئەندازەی یەکسان لەخودایان دوورن، پێویست ناکات لێرەدا گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکرێ داخوا ئیسلام بەراستی وەکو ئایینێکی تەواو

و بێ کەموکوڕی هەر لەسەرەتاکانی بەراییدا سەریهەڵداوە، لەرووی مێژووییەوە، ئەو تیۆرە زۆر پەسەند نییە [٩]، وێڕای ئەوەی موسڵمانان پابەندن بەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ: پێغەمبەرو هاوەڵانی نموونەیەکی راستەوخۆو هەمیشەیی بەرجەستە دەکەن، کە لەبارودروستە بۆ نەوەکانی دواتری نەتەوە، ئەمەش کارێکە کێشەیەکی ناکۆك ئامێز دەنێتەوە لەنێوان مێژوو نووسانی ((بیانی)) و موسڵمانان، بەڵام ئەو کێشەیە پەیوەست نییە بەمەبەستی ئێستامان، بەڵام ئەوەی بەراستی پەیوەستە بە بابەتەکەمان لەوە خۆی دەبینێتەوە، کە لەدەرەنجامی کۆتاییدا بەکردەنی شارستانیەتێکی ئیسلامی لەرادەبەدەر پێکهاتە رێکوپێك سەریهەڵدا، تیایا بەروونی بەدیاری دەخات لەوەی لەخۆی گرتووە لەنموونەی باڵای ئامانجدارو وێنەیەکی دیارو بەرچاوی خودییانە.

هەرسێ بنەمای سەرەکی و باوەکان، کە بەکردەنی پراکتیزەکراون لەرووی شەریعەتی ئایینی و سیاسی، هەروەها لەچوارچێوەی ئیسلامدا، بریتیین لە: پەیامی پیرۆزی ئاسمانی و درێژەپێدەریی هێزوپتەوییە شەرعیەکەی، گشت نەتەوە، لەدواییشدا ئیمامەتی پیرۆزی ئایینی (بۆ تاکە کەسەکانی — ئال ئەلبەیت — یا ئەو تاکە کەسانەی لێی بژارکراون) و جیاوازی لەجەخت کردنە سەر ئەوسێ پرەنسیپە بەشێوەیەکی رێژەییانە، ئەمە تیمە ئیسلامیەکان لێکجوێ دەکاتەوە: شیعە (لە پاشاندا فرەلکیان لێبۆوە) ئەوانەن ئیمامانی داوێنپاك و رێزدار پەسەند دەکەن، ئەوانەی ئادەتی، بەڵام نەك لە هەموو بارێکدا ((پۆشراوەکان)) نادیار لە نێو ئەو جیهانە یا لەجیهانی دیکە و چاوەڕوانیش دەکرێ لەزەمانێکی دیارینەکراو لەئاییندەدا، لێوەی بگەڕێتەوە، بەڵام خەواریجەکان ((پیوریتانیانی ئیسلام))(پیوریتانیزم: لە پیور-ەوە هاتووە واتە پاکیی —بە گشتی رۆحپاکیی- هەروەها پەتێیتی ئایین، ناتێکەڵویی ئایین، ئەو زاراوەیە سەرەتا لەئینگلتەرا پەیدابوو، ئینجا لەوێوە بەرەو شارەکانی دیکەی ئەروپا بڵاوبۆوە ) زێدە توندو چڕترین تیم دەنوێنن لەرووی بانگەشەکردن بۆ دادوەری و یەکسانی، لەکاتێکا سوننە مەزەب هەڵوێستێکی مامناوەندی دەنوێنن



لەگەڵ دووپاتکردنەوەیەکی زۆر لەسەر "سوننەگەریی" یا تەواوی گوتەو کردارەکانی پێغەمبەر، سەرەرای درێژە پێدان و شلۆقەکردنە بەربڵاوەکانی زاناو پسپۆرانی ئایینی و ئەهلی سوننەش تارادەیەك کەمتر موکورن لەسەر سیفەتە سیاسیەکانی تاکە کەسانی ((ئال ئەلبەیت)) [١٠].

ئیسلام سەرکەوتنێکی سیاسی هەرە زوو و خێرای بەخۆوە بینی، ئەمەش هۆیەکە لەوهۆیانەی سەرهەڵدانی دوالیزمی کلێسە - دەوڵەت تیایدا، کۆمەڵگەی ئۆرگیناڵی کاریزمایی پێویستی بەپێناسەو دیاریکردنی خودی خۆی نەبووە بەو پێیەی دژ بەدەوڵەتە، کە ئەوکات هێشتاکە بیرۆکەیەکی نامۆبوو، ئەو خۆی هەر لەسەرەتای هەوەڵیدا دەوڵەت بووە.

ئەو مێژووە پێشوەختە ناجێگیرەی کۆمەڵگەی ئەسحابان لەدەرکەوتنی ئیسلامدا بووە هۆی نانەوەی درز لە نێو گروپ و تیرەکان، بەڵام بەهەرحاڵ خەلافەت بنجی داکوتا و لەرەوتی هەردوو دەوڵەتی میراتگریی ئەمەوی و عەبباسی، ئیسلام فۆرمێکی هاوشێوەی ئێستای وەرگرت. حاڵەتی خەلافەتی عەبباسی داتەکا، ئینجا درزی تێکەوت و لەسەدەی سێزدەهەمیش داڕما، بەڵام هێزی ئیسلام لەژێر سایەی چەند دەوڵەتێکی یەك لەدوای یەك هاتوو هەر بەردەوام بوو، هەقیقەتی گرنگیش بریتیە لەنوشوستی کۆشش وهەوڵدانی هزرڤانی خودان ئاراستە فەلسەفییەکان بۆ دەرخواردی کردنی هزری ئیسلامی بەو ژەمە بەهێزەی فەلسەفەی یۆنانی پێش دەرکەوتنی ئیسلام، لاهوتییە نەیارەکانی فەلسەفە ئەوان بوون باڵیان کێشاو هاوکات لەگەڵ هاتنی سەردەمی بەرفراوانکاریە گەورەکانی خۆرئاوای کریستیانی، بەتەنیا سێ دەوڵەتی سەرەکی ئیسلامی هەبوون — عوسمانی و فارسی و مەگۆلی — سەرەرای چەند دەوڵەتێکی دیکەی دەوراندەوریان.

جا وێڕای ئەو لێکترازانە تیرەگەری و مەزهەبییە، ئەوە بنەما مەرکەزی و زێدە بایەخدارەکە لەئیسلام بریتییە لەو لەتبوونە ناوخۆییەی بۆ ئیسلامی دەستەبژێرو باڵا، کە رۆشنبیرییە چالاکەکەی خۆی لەزاناو پسپۆران و هزرڤانان دەبینێتەوە، ئیسلامی

بنكه میللی، كه عەوامە رۆشنبیرییە نزمەكەی دەنوێنن و تخوبی جیاكاریش لەنێوان ئەو دەوڵەتە بەشێوەیەكی گەش، ئاكار روون نەبوو، بەڵكە لەزۆربارردا فرە پلەدارو لێڵ و نادیاربوو، لەوكایەیەدا هێڵی دەست نیشانكردنی تخوبی پێك گەیەنەر پێك دەچن، بەڵام نەك هاوشێوە لەنێوان ئەو ناوچانەی بەكردەنی لەلایەن ناوەندی سیاسییەوە حوكم دەكرێن و ئەو ناوچەیەی بەهۆی خێڵە لۆكاڵییەكان و سەرۆكەكانیان بەڕێوە دەبرێن، هەرچەند دەوڵەتانی ئیسلامی لەرووی تیۆرییەوە پێكهاتەیان ئۆتۆكراتییە، ئەوە لە پراكتیزەكردندا ناچاربوون خۆیان لەگەڵ سەربەخۆیی ئیدارەی خودی خێڵە لۆكاڵیەكان بگونجێنن.

ئەو هاوپەیمانیەی نێوان ئەو خێڵانە، كەبەزەبری حەماسەتی ئایینی بۆ شەریعەتی ئیلاهی، كە مژدەدەرێ لەئاسمانەوە وەحی بۆهات و ئەمیش بۆی هێنان و شایستەی هەموو رێزو شكۆمەندییەكە، وایلێكردن بەشێوەیەكی كاتی یەكدیگربن، ئەوەش هەڕەشەیەكی هەمیشەیی بۆسەر دەوڵەتەكە چێ دەكرد، لەبەرئەوە لەواقعیدا ستەمكاریی لە رێی ئەو دەسەڵاتەوە دیاریكراووسنووردار بوو، لەلایەك هێزی كردەنی خێڵەكان كۆتبەندی كردبوو، لەلایەكی دیكەشەوە سەربەخۆیی شەرعییەتی یاسای ئیلاهی و مەحاڵی گەمە پێكردنی بۆ بەرژەوەندی خۆی، ئەو مەترسییەی رووبەرووی حاكمی موسڵمان دەبێتەوە خۆی لەبەیەكەوەلكان و گەلەكۆمەیی (تكتل) ئەو دوو هێزە دەبینتەوە: بزووتنەوەیەكی زیندووگەرییانە سوورە لەسەر پاراستنی/ یا گەڕاندنەوەی هەقیقەتی توندڕۆییانەی ئایینی، بەپاڵپشتی و پشتیوانیكردنی كۆمەڵگە خۆماڵییە دێهاتییە — ئۆتۆنۆمییەكان — یەكدیگیرو چەكدارو خاوەن شارەزایی سەربازی.

ئەو كۆمەڵگە لۆكاڵیانە ئادەتی شێوە رۆشنبیرییەكی جیاوازییان لەرووی ئیمانی بنكەیی میللی پراكتیزەكردووە، بەڵام حەزوتامەزرۆی لەهەمێزگرتنی یەكتاپەرستی لەلایەن ((دەستەبژێری باڵا))ی زێدە بێگەردو پاكژو هەرە توندو چڕ، لەژێر كاریگەرێتی شەپۆلێكی بێشوماری حەماسەت، سنووردارە لەمەڕ بەدیهیچنانی دەسكەوتی شارنشینی و سیفەتە سیاسیەكان.



ئەو جیاوازییە دیارو بەرچاوەی نێوان هەردوو رۆشنبیریی دەستەبژێری باڵاو میللی یاگەلدۆستی لە ئیسلامدا بەتەنیا پلەدار نەبوو، بەڵكە زۆرجاریش شاراوەو لێڵ و پەنهان بوو بەجۆرێك ئەستەم بوو درك بەولێڵی و نادیارییەی بكرێ، سەرەڕای هەقیقەتی توانای پشت گوێخستنی ئەو جیاوازییە لەزۆر باردا و پتەونەبوونی بۆوەی بەجۆرێك رادەیەكی دیاری جیاكەرەوە بێت، هەموو ئەمانە نیشانەیەكی گەوهەری بارە باوەكەیان پێكدێنا، هەروەها لەمیانەی فرەرەنگی پراكتیزەكردنی شێوازی كەشە داوونەریتییەكان، گوزارش لەو جیاوازییە كراوە، بەڵام بە ڕووالەتیانەو گشتی و ئاشكرا لەسەر شێوەی لێكترازانی بێ رادەی مەزەبی نەبوو، دەكرێ بەسانایی جیاوازی نێوان هەردوو شێواز بەیەكەوە بگوزەرێن بەشێوەیەكی ویستراوانەو ئاشتییانە، بەڵكە پێڕەوەكارانی رێبازی بنكەیی میللی لەئیسلام دەكارن تەنانەت شێوەی دەستە بژێری باڵا شكۆدارو پەسەند بكەن و دان بە دەسەڵاتی بنێن، لەكاتێكا بەردەوامیشن لەهەمێزگرتنی شێوە گەلدۆستییە نزمەكە، بەمەش دەكرێ خۆبەدوور بگیرێ لەرووبەڕووبوونەوەی هەردووگرووپ لەگەڵ یەكتریدا، بەڵام ماوە ماوە بارگرژیی پەنهانی نێوان هەردوو شێواز جارێكی دی سەرهەڵدەداتەوە و ناوبەناویش ئیسلامی دەستەبژێری باڵا جۆرێك لەبزووتنەوەیەكی پاكتاوكردنی ناوخۆیی بەرپا دەكات و هەوڵدەدات دووبارە بۆماوەیەكی دوورو درێژیش خۆی بەسەر تێكڕای كۆمەڵگە بسەپێنێتەوە، هەردوو شێوە لەرابردوودا هەرگیز بەخت یارییان نەبووە لەسەركەوتنێكی چارەنووسسازی كۆتایی، بەمەش نموونەی بەردەست دەكرێ ناونرێ ریفۆرمی ناكۆتایی یان ناوبەناو، ئیبن خەلدون [١١] هەروەك داڤید هیوم [١٢]، ئاماژەی بەو نموونەیە داوە، هەروەك چۆن فریدریك ئەنگلزیش لای لێكردۆتەوە [١٣] ئاماژەی داوە بەو هەقیقەتەی كاتێ زمانی ململانێی سیاسی لە مەسیحیەت و ئیسلام بەیەكەوە، ئایینی بوو، وەلێ لە مەسیحییەت بووە هۆی دووبارە و یەكبەدواییەكدی هاتنی كەسەكان لەسیستەمێكی كۆمەڵایەتی جێگیری نەگۆڕ، گومانیشی تێدا نییە تارادەیەك ئەنگلز بە ئیبن خەلدون كاریگەر بووە، گەرچیش ناوی نەهێناوە.

ئاشكرایە ئەنگلز بەجۆرێك گاڵتەی بەو چەقبەستنە ناوبەناوە یەكلە دواییە كە، گەر شیا وای ناوبنێین، هاتووە، لەخۆرهەڵاتییەكاندا بنجداكوتاوە، بەتایبەت موسڵمانەكانیان، وایشی دەرنەخستووە، كە هەراسانە یا تەنگەتاوە لە هەقیقەتی ئەوە، بەمە ئەو ناكۆك كەوتۆتەوە لەگەڵ یەكێك لەو بیروبڕوا سەرەكی و مەركەزییانەی ماركسیزم — ئەو ڕایەی دەڵێ: پێویستە ناسەقامگیریی لەهەموو كۆمەڵگا چینایەتییەكاندا بنجدابكوتێ و ((دژە یەكسانیشی)) وای لێدەكات مانەوەو بەردەوام بوونی راستەقینانەی زاڵیەتی چینایەتی مەحاڵ بێت [١٤] واش پێ دەچێ چەمكەكانی پێشكەوتن و بارگرژیی و دیالەكتیك، ئیمتیازاتی خۆرئاوایی بن و ناشكرێ خۆرهەڵات تەنیا مەندیی و بەستەڵەك بێت، چوون تەنیا خۆرئاوا هەیە تا لەچنگیان رزگاری بكات.

ئایا جیاوازی نێوان هەردوو شێوازی خوداپەرستی لەئاییندا چییە؟ ...

ئیسلامی دەستەبژێریی باڵا كەسانی زاناوداناوبلیمەتەكانیان لەمەڵبەندە شارنشینەكان لەئامێز دەگرێت و ئەوانەش بەزۆری سەربەچینی بورجوازی بازرگانین (چوون زۆرجار رۆشنبیریی وزانست لەگەڵ بازرگانی بەیەكەوە كۆدەكرێنەوە) كەحەزو مەیل و بەها سروشتییەكانی چینی مامناوەندی شاریی رەنگپێدەداتەوە (بەلای كەمی گەر مرۆ بەشێوەیەكی سەرەكی بیری بەلای شاری وەكو ئەدنبەرە، یا جنێف یا فاس یا ئەمستەردام پتر لە بوندقیە، چوو، یا فلۆرەنسا یا كاتمندۆ) ئەو بەهایانە، سیستەم دەگرنە خۆ، هەروەها پابەندیی بەڕێساو یاساكان و سەنگایەتی و رەسەنایەتی فێربوون، زۆر بەتوندیش دووردەكەوێتەوە لەوحاڵەتانەی هستریایی و زێدەڕۆیی لە رووی وروژاندنایەتی سۆزداری و ویژدانی، بەكارخستنێكی لەرادەبەدەری وروژێنەرە بیستن — دیتەنییەكانیشی یاریدەدەرن بۆ بڵاوكردنەوەی ئایین، ئەو شێوازە زانیارە بەرزەی ئیسلامی دەستەبژێریی لەرووی سروشتی تەوحیدی و نومۆكراتی (حكومەتێ بەپێی شەرع حكوم بكات) بەزەبری ئیسلام، پێگەكەی توند دەكات و قەدەغەكردنی حەزوخواستەكانی نێوان ئادەمیزادو خوداكەی، فامدەكات و بەگشتی رووەو



(پیوریتانێتیی) توندو تۆخ و دەقگیریی پابەندبوو بەسەددەرسەدی دەقی پیرۆز ملدەنێ [١٥].

بەڵام ئیسلامەتی عەوام، یا ئیسلامی بنكەیی میللی بەرۆشنبیرییە نزمەكەی، بەتەواوەتی جیایە، گەریش بەخوێندن و نووسین بەڵەد بوو، ئەوە بەشێوەیەكی سەرەكی بەكاری دێنێ بەمەبەستی نووسین بۆ مەرامی سیحر، نەك وەكو ئامرازێكی زانست و رۆشنبیریی و پێ دادەگرێ لەسەر جادووگەرێتی زێتر لەفێربوون، هەورەها ئیشتیاوتامەزرۆیی و سەرگەرمیی و وەجد و سۆفیگەرێتی زێتر لەوابەستەیی بەیاساو سیستەم، دانیشتوانی سادەو ساویلكەی دێهاتەكان، گەر شیا وابڵێین، بەپلەی یەكەم نووسینكاریی لەشێوەی نوشتەو جادوو تەلیسمی خەڵەتێنەر و داستانە -هەقایەت- خورافیە ناروونەكان، دەزانن و ئەو شێوە ئیسلامەتیەش گرنگی نادات بە دووركەوتنەوە لە پێناوداریی نێوان ئادەمیزاد و خوداكەی، بەڵكە بەدەوری خول دەخوات.

گرنگترین دەزگا دیارەكانی بریتیە لەنزیكبوونەوە لەزانایانی ئایینی و پیاوچاكانی — وەلی — و وابەستە بوون پێیان تا رادەی پەرستن، چوون زاناكە یا وەلی لەزۆر حاڵەتدا كەسایەتییەكی زیندووەو بەرچاوە (پیرۆزییەكەی لەباوكەوە بۆ كوڕ دەگوازرێتەوە) ئەو شێوەیەش لەئیمان بەروونی دیارە لەمیانەی ئەو كۆمەڵانەی بەئازادی دەبزوون و لەدەوری وەلییەكان / زانایانی خودان پێگەو شان و شكۆ و گۆشەو خانەقاكان كۆدەبنەوە، بەگشتیش لە ئەدەبیاتدا بەناوی ئیخوانیات — برایان — یا رێچكەی سۆفیگەریی یا برایی دینی، ناسراون.

هەریەك لەو دووشێوازە ئایینییە پێگەی خۆی هەیە لەرووی پێكهاتەی ستراكتۆری كۆمەڵایەتی، هەروەها سیستەمی ئەو گرووپە ئایینیانەی پێڕەوی زاناو پیاوچاكانی دیاروبەرچاو دەكەن، لەشوێن وناوچە دێهاتی و خێڵایەتی یا نیمچە خێڵایەتی پەرش و بەربڵاون و خزمەتگوزاریش لەوێ لەرادەبەدەر دەستەبەركراوە لە چوارچیوەی ئەو هەلومەرجە لادێییانە بەشێوەیەك كە ئاژاوەی پێوە دیارە: پێناوداریی لەنێو گروپە جیاجیاكان و ئاسانكاریی بازرگانێتی لەمیانەی گرێدانی بەحەجكردن،

دوایش نەك دووماهی، پێشكەشكردنی سیستەمێك لەرەمزە واتادارەكان، كە بەوپێیە ئیماندارە نەخوێندەوارە ساویلكەكان دەتوانن بەحەماسەتەوە ئاوێتە بن لەو ئایینە دەقئامێزە حەرفیانەیە، رەنگە موسڵمانانی دێهات، موسڵمانی ((بەدبەخت)) بن بەگوێرەی پێوەرەكانی زانستی شارستانی، ئەوانیش بەمە دەزانن، بەڵام رێزو پەسەندكردنی زانایان/ پیاوچاكانی لۆكاڵ، ئەوانەی گوایە بەپێی زنجیرەی بنەچەوە دەگەن بەپێغەمبەرەوەو بە نمونەی باڵای شاریی لەرێی كاروكردەوە زانستیە بێوێنەو تەواوكارەكانی باوانیان، وایان لێدەكات بەراستگۆیی و دڵسۆزی و خوێنگەرمییەكی هەڵایساو ئاوێتە و بلكێن بەكلتووری مەركەزی ئایین.

هەروەها سیستەمی لایەنگیریی و نزیكبوونەوە لە پیاوچاكان و زانایان خزمەتی هەژارانی شاریش دەكات، چون كەشێكی داوونەریتییانەی دوعاكردن ونزاكاریی ئەوتۆیان بۆ دەستەبەر دەكات گیان و بوونیان پڕ دەكەن لەوەجدو پەلكێشی و سەرگەرمییەكی بێشومار، دۆخ و كەشێك لەبارو گونجاو بۆ كۆمەككردنیان بەپەناگەیەك رووی تێدەكەن بەمەبەستی زێتر راكردن لەبارودۆخە دژوارەكە نەك وەك دووپات كردنەوەیەكی راست و دروست و توندو تۆڵی خودی ئایینەكە، ئەو جەژنە ئایینییانەو — مەولود — ئاهەنگ و هەڵسوكەوتە سۆفیگەریانە زێتر دڵنەوایی و سەبووری بەخشە بەو بێبەشیەی هەستی پێدەكەن لەوەی لاهووتە سكولائییەكان و فەتوای زانایان — فەقیهەكان — دەیكەن و ئەنجامی دەدەن. جا ئەگەر لە راستیدا ئەفیۆن خواستی خەلك نەبێت ئەوكات حاڵگرتن و سەرگەرمیی سۆفیگەریانە بەسوودو زێدەتر شیاوە بۆیان لە لاهووت و فەتوادان، هەروەها زانایان/ پیاوچاكان خزمەتگوزاریی چارەسەریانەش پێشكەش دەكەن، بەگشتی ناكرێ ئەوانە بەسەمتێكی جێگیرەوەی پیاوانی ئایین دانەنرێن لە چوارچێوەی ئیمانداریی ئایینی، كە بەرەسمی چینی دیارو ئەكلیرۆسی ناگرێتە خۆ.

چینەكانی شاریی خاوەن زێدە ئیمتیازاتی فێركردن و ئابووریی هەڵبەت بەخۆبەزلزانییەوە دەڕواننە هەندێ هەڵسوكەوتە بەلەسەییەكانی زانایان و



پێڕەوكارانیان [١٦] وەكو یاریی ماربازان بەمارە ژەهراوییەكانیان و وەرگرتنی مادده بێهۆشكەرەكان و هستریاو (ألمس) — دەست لێوەشاندن - ئستیحواز، سەما... و هیدیكە، بەڵام بەتەواوەتی هەڵەیە مەزەندەی ئەوە بكرێ، كەگوایە لەكاتە ئاساییەكاندا ئەو كەسانە بەتەواوەتی لەو رێورەسمە ئایینییانەی ئەو زانایانە بەڕێوەی دەبەن، خۆبەدوور دەگرن، هەروەك پەندێكی مەغریبی دەڵێ (ئەوەی بێ شێخ بێ شەیتان شێخیەتی) "شێخ لێرەدا واتە رابەر یا شێخی تەریقەت" جا بەگشتی و چونییەك هەڵەیە ئاوا بیر لەو رێگەو تەریقەت و كەش و رێورەسمە ئایینییە میللییانە و دانیشتوانی دێهاتەكان ئەوانەی پێڕەوی دەكەن، بكرێتەوە، بەو پێیەی كەسانی پێڕەوكاری كوێرانەن بۆ زانا یا پیاوچاكانیان، ئەوانەی واراهاتوون لێیان نزیكببنەوە. هەروەك چوون پەندێكی جەزایری هەیە دەڵێ (هەمیشە لێرەدا مارێك لەهەر گۆشەیەكدا هەیە) "گۆشە چەقی جیهانە یا تەكیەو خانەقای وەلی — پیاوچاكانە" [١٧] سا كەسانی ساویلكە سوود لەو زانایانە وەردەگرن و رێزیان لێدەنێن و پەسندیان دەكەن، لەهەمانكاتیشا گاڵتەیان پێدەكەن.

ئیسلامی باڵا بەو رۆشنبیرییەی خۆی شارنشینان و تارادەیەكیش تێكڕای توێژەكانی كۆمەڵ، كۆمەكی دەكات بەهۆی یاسا دانراوەكەیان و دستورە پتەوە رەگداكوتاوەكەیان، كە بەهۆیانەوە دەتوانن رێ بگرن لەدەستدرێژیی و سنور بەزاندنی دەوڵەت، كە هەرە دیارەكەشیان سەپاندنی باجی زۆر زاڵمانەیە، لەشارەكاندا رەشوڕووت، خەڵكانێك بەئاژاوە دەست دەكەن بەگێرە شێوێنی لەژێر سایەی سەركردەیەكی فەقیە، زانای بەرێزو بە شانو شكۆ، بەڵام ئەمە هەڕەشەیەكی راستەقینە نییە كە بەگژی دەسەڵاتە فەرمییەكاندا دادەچێتەوە، مەترسی راستەقینەی هەرەشەكە لەو هاوپەیمانییەی كە لەنێوان زانایەكی خودان رێزو حورمەت و ئەو خێڵە لاپەڕانەی هێزێكی شایستەی سەربازییان هەیە خۆی دەبینتەوە، ئای چ قەدەرێكی گاڵتە ئامێزە، ئەو خێڵانەی، كە هەڵسوكەوتە رۆژانەییەكانیان و زانیارییەكانیان لەبارەی ئایینەوە گەلەك نیشانەی پرسیار جێدێڵن بەگوێرەی ئەو بۆچوونە (رێگە

شارنشینییه) توندخوازه، لەهەمانكاتدا ئەو بازووه چەكدارەشە ماوه ماوه هێزی سەربازی و سیاسی دەبەخشێته هەمان (ڕێگە شارنشینییه)كە و ئەو بوارەش دەرەخسێنێ تا نوێبوونەوەیەكی رابوونانەی بەرفراوان چێ ببێ، ئەوەیشی روودەدات ئەوەیه واعیزێكی دینی كۆمەڵە خێڵێك یەكبخات و بەتوندیش رەخنە لەتاكە كەسەكانی بگرێ بەهۆی نەزانی و پوكانەوەو سستو بێهێزیان، بەڵام لەهەمانكاتدا هانیان دەدات بۆ پشتگیریی كردن و لایەنگیریی كردنی لەپاكسازیی كردنی شارو كۆشك و سەرای حاكمەكە لەگەندەڵی، ئەو كارەی بەلای ئەوانەوه رێككەوتانە واتای هیوایەك دەدا بۆ بەدەستهێنانی دەسكەوت، گەریش بۆ نموونە پاریس شایستەی قوودداسێكی دینییه، ئەوه پیاوانی خێڵەكان بەگشتی شارێكی وەكو فاس (یا هەر شارێكی دیكەی هاوشێوەی) ئاوا لەقەڵەم دەدەن، كەشایستەی شتێك لەپاكیی و بێگەردیه، جا لە رێگەی ئەو شێوازەدا بەربلاویی دەستەبژێر كاریگەری خستەسەر كولتووری لاساكەرەوانەی ئیسلام.

ئەو شێوازەی فۆرمەڵەكردنی دەوڵەت یا دەستپێكی بنەوەچەی خانەوادەی فەرمانڕەوا جارەهای جار لەمێژووی ئیسلامیدا دووبارە روودەداتەوه، تاوەكو سەردەمی نوێش بەردەوام هەڵكشاوه، ئەمەش لەشێوەی بزووتنەوەگەلێ بوو هەندێكیان هەرزوو بەدەركەوتن بەجۆرێ هاوكات ئەستەمە بەسانایی راڤە بكرێ وەكو دەرەنجامێ لەمەڕ كاریگەرێتی بەسەر خۆرئاوادا: بزووتنەوەی وەهابییەكان لەناوەڕاستی دورگەی عەرەبیدا و ئەو جیهادەی عوسمان دان فودیۆ لە باكووری نێجیریا بەرپای كردو سنوسیەیی لە لیبیاو مەهدینیزم لەسودان، بەڵام بزووتنەكانی دیكە كاردانەوەیەكی راشكاوانەی بەرفراوانكاریی كۆلۆنیالی خۆرئاوایی بوون: عەبدولقادر لە جەزایر، عەبدولكەریم خەتابی لەباكووری مەغریب و "مەلا مەجنون"ی سۆماڵ و شامێل لە قەوقاز. هەریەك لە بزووتنەوەی وەهابییەكان و جیهاد تاكو ئەمڕۆش بەردەوام بوون لەپێكەوەنانی ئەو بنەمایەی سیستەمی سیاسی وڵاتەكەیان لەسەر هەڵنرا، بزووتنەوەكان لەرووی ئەو مەودایەی دەیگەنێ بەیەكناچن لەرووی تەنیا



پشت بەستنیان بە بنەماكانی شێوه دەستبژێریی باڵا لەئیسلامدا: چوون لەزۆر باردا بەمەبەستی تیا ئامادە بوون دەستبەرداری بیروباوەڕەكانی دەبێت، بەڵام پێویستی رێكخستن بەلای نەویستراوه لەمەڕ بەخۆوەگرتنی زاراوەو بنەما رێكخستنەییەكانی رێچكە ئایینییەكان، سنوسییەكان بنەما رێكخراوەییەكانی رێچكە ئاینییەكانیان بەكارهێنا بۆ بڵاوكردنەوەی بیرورا زیندووكەرەوەكانی دینی.

لەرابردوودا ئەو بزووتنەوانە چییان بەسەرداهاتبوو لەجیهانی نوێش چییان بەسەرداهات؟ .

جیهانی نوێ بارودۆخێكی ئاوای دەردا زۆر جیاواز بوو دەگەڵ جیهانی تەقلیدی، هەروەك ئیبن خەلدون سەرنجی دایێ و فریدریك ئەنگلزیش سەداكەی گوتەوه، بەسادەیی - چەرخەكە — یەك خولی تەواو سوڕایەوه، ریفۆرمخوازە ئایینییەكان باڵیان كێشا (هەڵبەت هەر هەموویان نا — چەندانیان بانگێشت كران، بەڵام كەمەكیان دەستنیشانكران — وەلێ ژمارەیەكی كەمیان ناوەناوه سەركەوتنیان بەدەست هێنا) و تاوەكو جارێكی دیكە سیستەمێكی زێدە پاكژو بێگەردانەیان دادەمەزراند ئیدی كارگەل پلەبەپلە دەگەڕایەوه سەرباری سروشتی خۆی. رۆح پڕبەدڵ تامەزرۆو ئامادەیە، بەڵام جەستەی كۆمەڵایەتی سست و لاوازو پەژمردەو پەككەوتەیە {پیوریتانێتیی تێكست}وابەستە بە یاساو رژێم، رەنگە زاناو فیقیهاكانی شارستێنی بەئاسانی پیادەی بكەن، بەڵام بەلای گشت جەماوەر لەشارەكاندا یا خێڵەكانی دێهاتەكان ئاوها نەكەوتۆتەوه. چوون ئەوانە لەمیانەی درەوشانەوەی دەمساتێكی بەجۆشوخرۆشی زیندووكردنەوەی ئایینی و خەباتێكی تێكۆشەرانە لەپێناو جێبەجێكردنی، دەیگرنەبەر. بەڵام ئەوان هەركاتێك گەڕانەوه نێو ژیانی ئاسایی ژێر رەشماڵ یا دێیەكانیان، ئەوه ئانوسات ئەمە لە بیر دەكەن ئەویش لەبەر چەند هۆیەك، كە لەسۆسیۆلۆجیای دۆركهایمی دۆزراونەتەوەو چاك تاقیكراونەتەوه ، ئەوان پێویستیان بە فۆرمەڵەكردنێكی ئایینی ئەوتۆیە نیشانە گەلی زەمانی - مەكانی بەكۆمەڵگا ببەخشێ، بەجۆرێ تخوبی لێكجیاكەرەوەی نێوان خێڵ و تیرەو

گرووپە لاوەکییەکان و جموجوڵە وەرزییەکان بەدیار بخات و کەشە داوونەریتیەکان و رابەرە ئایینییەکانی ریورەسمە ئاهەنگ ئامێزو جەژنەکان دیارو دەستنیشان بکات، کە فۆرمە نموونەیەکی (ژیان) بەژیان دەبەخشیْ [18]. سەرەرای ئەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هۆی خۆی هەیە، کە ئەقلی لاهووتی شتێکی ئەوتۆی لەبارەوە نازانیْ، بەمەش جارێکی دیکەو سەرلەنویْ شێوازی ئیمانداریێتی رکابەر خودی خۆی دووپات دەکاتەوە، لەسایەی پاراستنی ئەوەی هاتووە لە هەمان وەچەی سەلەفییە ریفۆرمخوازان لەزۆر حاڵەتدا، ئەوانەی لەژێر بەیداخی حەماسەتی توندی ریفۆرمخوازیدا گەیشتنە سەرتەختی دەسەڵات.

بەڵام لەسایەی هەلومەرج و بارودۆخە [19] نوێیەکەدا چ شتێك لەم بابەتە روونەداوە. باری کۆنی باو پشتی بەستبوو بەهاوسەنگی هێزە سەربازی و سیاسییەکان، چوون دەسەڵاتی ناوەند بەسانایی ئەو ئامرازانەی لەدەستدا، کە یاریدەدەری بوون بۆ خود دووپاتکردنەوە بەشێوەیەکی ئەکتیڤ و کارتێکەر لەبیابان و چیاکان و لەبەشە گەورەکەی دێهاتەکانیش ناچاربوو پاراستنی رژێمەکە بۆ دەستی گرووپە خۆماڵییەکانی خودان – ئۆتۆنومی – خۆبەڕێوەبەر بەجێبێڵیْ، کە ئادەتی بەناوی ((خێڵەکان)) ناسراوە، بەڵام ئەو پێداویستییە زۆرەی بۆ پێناوداریی نێوان گرووپە خۆییە کۆمەڵایەتییەکان و خواستی ئەنجام دانی، ریتمە بەدواییەکداهاتووەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، بووە هۆی پەلکێشکردن و گلدانەوەی ئەو پێناوە – رێپیشاندەرانەی جڵەوی بەدیهاتنی هاوسەنگی هێزیان گرتە دەست، هەروەها بەڕێوەبردنی فیستیڤاڵ و ئاهەنگە ئایینییەکان و ئەوانەی بەزاناکان ناسران و بەهەمان خێرایی لێدەربازبوونیان، گەڕانەوە.

بەڵام گشت ئەوانە ئێستاکە گۆڕاون، تەکنیکی کارگێڕی و سەربازی و گەیاندن و پێوەندی پێکردنیش لەلای دەوڵەت لەهەردوو قۆناغی کۆلۆنیالی و دوابەدوای کۆلۆنیالیش دەستەبەرکراوە، ئەوانە هەموویان دەبنە هۆی پرۆسەیەکی ئەکتیڤانەی یەکخستنی ناوچە جیاجیاکانی و سێنترالیزەکردنی کاریگەریی سیاسی لەزۆر حاڵەتدا



(وێڕای هەندیْ هەڵاوێردن وەکو کەرتی باکووریی یەمەن) لەپاشانیش داخورانی گرووپەکانی پێشووی لۆکاڵ ئەوانەی یارمەتی یەکتریان دەدا، کزی ولاوازیشی واتە پێویست نەبوونی بەو خزمەتگوزارییانەی پێناوداره لێڕاهاتووەکانی یاخود کەمکردنی ئەو پێداویستیە بەشێوەیەکی بنەڕەتییانە، هەروەکو حاڵی ئورستوکراتیەتی فەرەنسایی لەمیانەی دواقۆناغەکانی رژێمی کۆنی بەسەر چوو، کە تۆکفیل پێی وایە، پیاوانی ئایین سەیریان کرد هێشتا خودان ئاکارو مافی تایبەتی خۆیانن، بەڵام چیدیکە ئەرکی فەرمانبەرێتییان بەئەنجام نەدەگەیاند، ئەمەش حاڵەتێکە بەدیقەت حیسابی بۆ کراوە تاوەکو مایەی بێزاریی و وەڕەسی بێت، هەر ئەمەش بوو روویدەدا، لەناکاو ئیمانداران وەبیرخۆدێننەوە، کە نوسخەی هەرە بەشۆرەت و پاکیان لەئیماندا پێناوداریی قەدەغە دەکات، یا ئەوان بەتاسەو تامەزرۆیەکی زۆرەوە گوێدەگرن لەواعیز/ وتاربێژان بۆوەی بەبیریان بخەنەوە، جارێکی دیکەش نوێبوونەوەی نوسخەی راستەقینە لەئیمان بەدەردەکەوێتەوە هەماهەنگ لەگەڵ شتیْ لەتوندو تیژی و زێدەڕۆیی، ئەمجارەش ئەو تاهەتایە دەگەڕێتەوە.

ئیسلامەتی وەرچەرخا، کە لەرابردوودا بزووتنەوەیەکی ریفۆرمخوازانەی تاهەتایی یا ناوبەناو ناوەکەی بەرجەستە کردووە و هەمیشەش راستکارو چاکسازی رەفتاری ئەخلاقییانەی ئیمانداران بووە، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز کاری لەسەر هەتا هەتایی – هەمیشەیی – ئەمە نەکردووە، لەمیانەی سەدساڵی رابردوو رووەو چاکسازیی یەکلاکەرەوەی کۆتایی وەرچەرخاوەو بە هەمان ئەندازەی حومکدانی مرۆ، بەهەمان شێوە ئەستەمە هەڵبوەشێنرێتەوە.

ئەو ساڵانە هەنگاونانێکی بێشوومارییان لە رووی هاوسەنگی لە ئیسلامی بنکەیی میللییەوە بەرەو ئیسلامی باڵای دەستەبژێر هێزەوە بەخۆوە بینی. چوون بنەماکانی فاکتەری کۆمەڵایەتی ئیسلامی میللی لەبەشە گەورەکەیدا دووچاری داخوران هات، لەکاتێکدا پشت وپەنای چینایەتی ئیسلامی باڵای دەستەبژێریی بەهێزو پتەوتر بوو، هەروا شارنشینی و سێنترالیزمی سیاسی و ئاوێتەبوون لە بازێڕێکی فراوان و

کۆچکردنی کارگەری کرێگرتە، تەکانیان بەدانیشتوان دا تاوەکو رووەو فۆرمی فەرمی (لاهووتیانە) و زێدە ((تەندروست)) لە ئیسلام ملبنێن.

خولیاگەرێتی لەئیسلامی ریفۆرمخوازدا، رۆڵێکی ئاوای گێڕا زۆر بەرۆڵگێڕانی نەتەوە دەچێت لە شوێنەکانی تردا، لەراستیدا جوێکردنەوەی هەردوو بزووتنەوە لەولاتانی ئیسلامیدا سانا نییە، هەروا کەسی ئیمانداری ئاسایی ناتوانێ هەروا بەبێ ئەستەم بەردەوام بێ لەدیاریکردنی شوناسەکەی بەپێی مەیل و لایەنگیریی بۆ خێڵەکەی یا بۆ نەزرگەو مەزاری پیاوچاکی خۆیی، خێڵی تاکوتەرا هەڵوەشایەوە و خەڵکیش مەزاری پیرۆزیان چۆڵکرد، هەردووکیشیان مایەی شك و گومان و راراین بەگوێرەی پێوەرە نوێیەکان یاتەنیا وەك پارچەیەکی فۆلکلۆری جوانن گەشتیارانی بیانی بۆخۆی رادەکێشێ، بەڵام ئەوە لەشان و شکۆی هاوولاتی شارنشینی دەوڵەتی نوێ ناوەشێتەوە، چوون نیشتەجێ بووی شار بەئاشکرا خۆی وەدەرناخات لە کاتی بەشداربوونیا لە ئاهەنگ و رێورەسمی نەزرگەی پیرۆز، چ جای رێگەدان بە ئامادەبوونی هاوسەرەکەی یا کچەکەی یا خوشکەکەی، هەروەها ئەو ناکۆکییانە چارەسەر ناکات، کە تووشی دەبێ بەهۆی بانگێشتی کوڕەمامەکانی بۆ بەرگری یا شایەتی دان لەمەزارگەی پیاوچاکەکە، ئەو دەزانێ دژایەتیکردنی یاساغەو پۆلیسیش دایدەمرکێنێتەوەو دەمکوتی دەکات، دەشزانێ لە توانایدایە بەچاکترین شێوە خۆی بپارێزی بەبەکارهێنانی هەر خەسڵەتێك هەیەتی لەنێو تۆڕە پەیوەندییە سیاسیە فەرمیەکان و نافەرمییەکاندا.

ئیسلام شوناسی نەتەوەیی دەبەخشێتە پەیرەوکارانی خۆی، نموونەی هەرە دیاریش لەم رووەوە خەبات دژی کۆلۆنیالیزمە — ((ئوممەت))ی نوێی ئیسلامی لەزۆر باردا بەسانایی بریتییە لەکۆ دەرەنجامی موسڵمانان لەناوچەیەك لە ناوچەکان، ئیسلامی ریفۆرمخوازیش، شوناسێکی راستەقینەی هاوبەش دەدات بەوەی رەنگبێ ببێت ئەگەر نا هەرتەنیا کۆمەڵەکۆکراوەیەکە لە هەژارانی نەدارونەبوو، هەروەها بە جۆرێك کۆکە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی ژمارەیەك لە موسڵمانی هاوچەرخ لەو بارودۆخە



دێهاتییە سادەیەیان بۆوەی بن بەدانیشتوانی شارەکان و زێدە چاکتر چاوکراوەو بەمەعریفەتربن، یا بەلای کەمی کەسانێك بن کە ئاراستەیەکی شارستانێتیان هەبێت.

بەپێچەوانەی ئەو گریمانەیەی هەندێ لە چاودێرانی بیانی بەگشتی دەیخەنە ڕوو، ئافرەتی موسڵمان لەشارێکی ئیسلامیدا لەچکەو سەرپۆش لەسەر ناکات لەبەرئەوەی داپیرەی لەسەری کردووە، بەڵکە لەبەرئەوەی داپیرەی سەری والابووە: داپیری لەدێیەکەی زۆر سەرقاڵ بوو بەکێڵگەکەی و واش راهاتبوو بەبێ لەچکە سەردانی مەزاری پیرۆز بکات، چوون ئەوەی بۆ ئەوانەی لەخۆی چاکترن بەجێی هێلاوە، بەڵام نەوەکەی بەو هەقیقەتە دڵخۆشە نەك لەسونگەی لایەنگیریی بۆ داپیرەکەی، بەلکە بەهۆی چوونەریزی ئەوانەی لەداپیرەی چاکترن، هەروەها ئیسلام بەردەوام دەبێ لەگێڕانی کۆنە رۆڵی خۆی، کە لەخستنەڕووی جۆرێ لەدەستوری تاهەتایی قایم و پتەو خۆی دەنوێنێ، کە بەوهۆیەوە دەکرێ رەخنە بگیرێ لەوچینە بورجوازییەی ئێستاو تارادەیەك بەرفراوانە، یا دوور نییە پاشەکشە بکات و جاروبار تەکنوکراتەکەی ترۆپکی هەرەمەکە بەسەربکاتەوە و زەبت بکات، کاتێکیش ئەوانە رازی دەبن بەزەرورەتی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی راستەقینە (بەهۆی خولیای پیادەکردنی پێوەرەکانی مومارەسەی سیاسی کە بۆ نموونە لەرووی نێودەوڵەتییەوە دانی پیانراوە) بەمەش دوورنییە ئەوان لەبنکەکانی دەنگدان خۆ ببیننەوە جێگوڕکێیان پێکراوە نەك بەپێشەوا میللییەکان بەڵکە بەبناوانگران.

وەك من دەیبینم ئەمە ئەو میکانیزمە دەنوێنێ، کە هەڵسووڕێنەری شۆڕشێکی رۆشنبیریی سەرەکی بوو لە جیهانی ئیسلامیدا کە لەمیانەی سەدساڵی رابردوو روویدا، شۆڕشێك بەلای کەمی تابەر ماوەیەکی  کورت ئیدی بووە مایەی بایەخدانی خۆرئاوا، ئینجا پاشان بگات بە درککردنی روودانی شتێکی گەورە بەشێوەیەکی سەرەکیش لەژێر کارتێکردنی بوومەلەرزەی ئێرانی، بەڵام ئەمە چەند تێبینیەکی تایبەتی گەرەکە. مەزەبی شیعەگەریی نزیکەیی ئەو سەمتە نموونەییە باوە لەئیسلام پێکناهێنێ، وێڕای تەبایی لەگەڵ ئەو دەستنیشانکردنە شیکەرەوەیانەدا بەگشتی

خراوتەڕوو، ئەوە زانینی مەرج و رەگەزە دیاروجیاکان هەر وەك کارێکی بەهەندگیراو دەمێنێتەوە و مەزەبەکەش لەدوو تویێی ئیسلامی سوننی دا هەندێ نیشانە وخەسڵەتی دیارو بەرچاوی شێوازی بنکەیی میللی هەیە، هەرە دیاریان خولیای هەرە بایەخداری رووەو پێرسۆنالیزمە (شەخسانیەت) چوون دەکرێ بەکردەنی پێناسەی شیعەگەرێتی بکرێ و دیاری بکرێ بەوپێیەی رێزداریی و شکۆدارییە بۆ ((ئیمامی نادیار)) سەرەڕای ئەوەی دەسەڵاتی باڵای دوماهی لەرووی سیاسی و لاهووتییەوە دەخاتە پاڵی ئەو، بەمەش بارودۆخەکە ئاڵۆز دەبێ لەئاکامی ئەو راستیەی ئەو کەسە پیرۆزە بەگشتی لەپەناگەکەیدا ونە و لەو ماوەی ونبوونەشیدا لەچاوەڕوانی گەڕانەوەیدا لەسەرکەسێکی دیکەیە جڵەوی ئەو ئەرکە کارگێڕییە سیاسی و ئایینیانە بگرێتە دەست، کارێکە مرۆ دەجۆشێنێ تا بڵێ هەمان ئەو هێزی سایکۆلۆجییەی یا کۆمەڵایەتییەی جڵەوی موسڵمانە سەدە درەنگوەختەکانی گرت رووەو پەرەستنی وەلی — پیاوچاکان — (بەڵام ئەوکات، لە زۆر حاڵەتدا نەدەبووە هۆی دابەشبوون) بووە هۆی لێکترازانی شیعە لە قۆناغی هەرە زووی بەرایی رسکانی ئیماندا، هاندەری بزوێنی ئەمەشی لایەنگیریی بۆ رابەران و شەهیدە پیرۆزە نەمرەکانن.

بەڵام گەر هۆی پەسەندکردنی ئیسلام تا ئەورادەیە لەجیهانی نوێدا رووەو پیوریتانێتیی و یەکسانی و دەقگریەکەی بێت، لەبەرچی زۆربەی سەرکەوتنە سیاسییەکانی و هەرە پتریان دراماتیکی یەکە بەهۆی ئەو نوسخە ئیمانییەی بەدیهێنا، کەئەو سیفاتانەی تیا نییە، بەڵکە بەپێچەوانەوە بەدژەکانی ئەو سیفاتانە ناسرابوو؟ جیاوازکاریی لەشۆڕشی ئێرانی بریتییە لەوەی کاتێ بزووتنەوەی خومەینی بەشێوەیەکی بێشوومار سوودی لەتایبەتمەندە دیارەکانی شیعەگەریی وەرگرت لەپرۆسیسی تەیارکردنی شۆڕشگێڕیەتی لەلایەك، وەلێ لەلایەکی دیکەوە خومەینی توانی شیعەگەرێتی ئێرانی بگۆڕێ بەرەو جۆرێك لە ((بەسوننی کردنی)) مەزەبەکە لەمیانەی پرۆسیسی بەدیهێنانی سەرکەوتن و گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسی، تەکانێکی ئەوتۆی پێدا زۆرنزیك لەشێوازە، بێگەردە پا پیوریتانیەتی ئیسلامی سوننی باڵا [٢٠].



مەزەبی شیعەگەریی بەتوندی لەدەوری رێزداریی و شکۆداریی کەسایەتییە ئایینییە پیرۆزەکان دا چەقگیرە، بەر لەهەرشتێکیش شەهیدانی شیعە و بیرەوەری شەهیدبوونی ئەوانیش زیندووانە و چالاکانە لەیادگەی گەلدا دەپارێزرێن لەرێگەی خۆنیشاندان و رێپێوانە نمایشکارانەی سۆزداریی ساڵانە، شیعەچییەتیش سیفاتی دیاریکراوی ئاواش هەڵناگرێ بەتەنیا هاوشێوەی ئیسلامی سوننی گەلدۆستی بێ، بەڵکە کریستیانیش، سێنترالیزمیی بیرۆکەی شەهادەت و شەهیدان، واتە: زانایانی شیعە تەنیا لاهووتی/ یاسایی نین، بەڵکە پسپۆرن و بەژیاننامەی ئەو شەهیدە دەزانن، کەلەرووی گرنگی و بایەخیدا پێگەیەکی چارەنووسسازی هەیە [٢١]. ئەمەش واتە ئەوان چاکتر ئامادەو بەکەرستەن لەپێوەندیکردن بەجەماوەر لەحاڵەتی بارکرژیی و هەڵچوونی سیاسی بەبەراورد لەگەڵ خزمانی سوننی. —شەهید بوون کەرستەیەکی وروژێنەرە، زێدە وروژێنترە لە نازانستەیی ماددەکانی یاساو لاهووت وهەقیقەتی ئەوەش گوایە شەهیدبوونی ئۆرگیناڵ لەلایەن سەرەگەورەی (ولی أمر) موسڵمانان بەشێوەیەکی فەرمی چەسپاوە کارێکی حاشاهەڵنەگرە، وادەکات ئامادەگییەتی هاوشێوەی پێشتر دژ بەهەر ستەمکارێکی موسڵمان، بەشێوەیەکی تایبەت کارێکی ئەکتیڤ و کارتێکەر بێت، هەموو ئەمانە ئەکتیڤانە بەکارخراون، لەمیانەی گلدانەوە و خرۆشاندنی هستریای گەلەکۆیی، کە شۆڕشگێڕەکانی پاڵنا بۆ رێگەدان بەپیاوانی شا، تاوەکو ژمارەی زۆرو زەوەندییان بپلیشێننەوە وقرچوبڕ بکەن لەدواییشدا ئەو زل و زەوەندییە بووە هۆی هەرەسهێنانی هۆشوگۆشی ئۆردوی دەسەڵات، بەڵام وێڕای ئەوەی بابەتگەلی شەهیدبوونی تاکەکەسی ئەوەی بەشێوەیەکی چڕ و یەکلاکەرەوە لە خودی شۆڕشەکەدا بەکارخرا، وەلێ ئەو شیعەچییەتییەی خومەینی لەکۆتاییدا خستیەروو وەکو یاسایەکی دەستوریی سیستەمی تازە بەتەواوەتی جیاوازکەوتەوە، سەبارەت بەزانا زرنگە بچووکە بەرچاوتەنگەکان، فەرمانی توندییان بۆ دەرکرا بۆ چاککردنی شێوازیان یا رووبەرووبوونەوەی ئەنجامەکان خوومەینی بەشداری لەگەڵ ئەوانەدا کرد، کەخۆیان بە پێناو دانابوو لەرووی رایە ریفۆرمخوازیە پێوەرییەکان، بەڵام ئەوەی

پەیوەستە بەئیمامە نادیارەکان بەهەرچی هەیانبوو لەتاکیایەتی و قودسیەت بەمانا حەرفییەکەی، ئەوانەی سەرچاوەی دوماهی شەرعیەت دەنوێنن و هەڵگەرانەوەی تا کۆتایی تەفسیر بەکۆتا دێنن، ئەوانە بەمانای سیاسی وشەکە خانەنشین کران، چوون خومەینی نکولی لەوە نەکرد ئیمامی نادیار هەر کە گەڕایەوە حکومدەکات و دەبێ بەتاکە حاکمی شەرعی. بەڵام بەرپرسێتی فەرمانڕەوایی پەسەند دەکات بەوپێیەی ئەرکێکی سەرباری دژوارو سەختە، لەگەڵ شتێ لەبێزاریی، ڕۆڵە سیاسیەکەیشی بەتەواوەتی جیایە لەرۆڵە ئایینییەکەی، سەرباری هەموو شتێکیش، حکومکردنیشی ببڕای ببڕای جیاواز نییە لەوەی ژێر حوکمی بریکارانی یا مەلا ئایینییەکان ئەوانەی لەکاتی نادیاردا حوکمیان کرد بەگوێرەی بنەمای ویلایەتی فەقیه .

ناوەڕۆکی بنەڕەتی فەرمانڕەوایی بەرای خومەینی نەزیادو نەکەم بریتیە لەجێبەجێکردنی شەرعیەتی خودایی، پێویستیشە توندو پتەوانە بەبێ کەم وزیاد، پێش یا پاش گەڕانەوەی ئیمامی نادیار، جێبەجێ و پیادە بکرێت و دیارە هەمان شەریعەتیشە بەهەمان پلەی توندوتۆڵی بەبێ زیادەڕۆیی یا زیادە ڕۆییکردن، شەریعەتەکە گرنگە [٢٢] نەك ئەو کەسەی پیادەی دەکات، پاشانیش سێنترالیزمی شەرع جێگەی سێنترالیزمی کەس دەگرتەوە، هەروەها خومەینی هەڵسا بەگوێزانەوەی مەزەبی شیعەگەریی بەرەو کۆمارە دیار و جیاکەی بەجۆرێک لەراستیا کە کۆماری مەلایەکانە. ئەمەش هەمیشە چەمکێکی شاراوەی زمنی لەلۆجیکی شیعەگەری دەنواند، بەڵام فشاری راستی و وەقایعە سیاسییەکان شیعەی ئێرانی ناچارکرد لەرابردوودا خۆیان بسازێنن بۆ پێکەوە ژیان لەگەڵ جۆرێ لە مەلەکیەتی گوێزەرەوە، خێڵەکان پێویست بوون بۆ شۆڕشی سیاسی، و سەرەك خێڵیش بەوپێیەی شایە دەگەیشتە دەسەڵات، بەڵام ئەو پێداویستیە لەژێر سایەی هەلومەرجە نوێیەکە هەر ئاوا بەردەوام نەبوو، لەپاشانیش، ئەو دیاردەگەلەیەکسانییەی دژ بە پێناوداریی لەئیسلامدا دەتوانێ ڕۆڵی خۆی تاکو کۆتایی بگێڕێ، بەمەش مەلایەکان لەنێو زانایانی ئایینی دەتوانن بەبێ پشتیوانیکردنی بنکەیەکی خێڵایەتی بۆ دەسەڵاتیان



حکوم بکەن، لەدەوڵەتی نیمچە نوێدا، ئەو جۆرە بنکەیە چیدیکە لەم رووەوە مەرجێکی پێویست نەبوو. تاوەکو بەردەوام پێشکەوین لەو گفتوگۆیە جەدەلییە دەڵێین ئێمە لە ئیسلام جۆرە ئیمانێکی ئایینی بەدیدەکەین لەو تەرزەی لەمیانەی قۆناغی بەر لە پیشەسازیی باوبوو، واتەئایین وەك دامەزرێنەری ئەقیدەیی بەمانا راستییەکەی وشەو توانادارە بۆ بەرەنگاربوونەوەی تێزی عەلمانیەت بەشێوەیەکی هەمەکی و کاریگەر بەلای کەمیش لەم کاتەی ئێستادا. تا ئەو ساتەش شتێ نییە ئاماژە بە وەبدا کەملکەچانە خۆدەداتە دەست عەلمانییەت، لە ئایندەشدا وێدەچێت ئەو هۆیانەی وایانکرد ئەو دەسکەوتە بێتەدەست لەوەدا خۆی دەنوێنێ: هەموو دەوڵەتانی ((دواکەوتوو)) بەلای رووبەرووبوونەوەی کێشەو گیروگرفتی دیاریکراودا دەچن (مەبەستم لە دەوڵەتی ((دواکەوتوو)) هەر کۆمەڵگایەکە بەبێ ئابووری — سەربازیی قووڵ، بەجۆرێك تەنیا بە هۆی ریفۆرمی گەوهەری لە بونیاتە پێکهاتییەکەیدا چارەسەر دەکرێ، بۆ نموونە فەرەنسا لەسەدەی هەژدەهەمدا دەوڵەتێکی دواکەوتوو بوو، هەروەها ئەلمانیا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا) بەڵام ئەو ئیشکالیەتەی رووبەڕووی ئەو دەوڵەتانە دەبێتەوە بریتیە لەوەی: ئایا لەسەرمان پێویستە چاو لەو دەوڵەتانە بکەین، کە حەز بە هاویەکسانیان دەکەین لە هێزداو ( دوایش بەسووکایەتییەوە کەلتوریی باومان رەت بکەینەوە) یاخود لە سەرمانە بەپێچەوانەی ئەمەوە، سووربین لەسەر بەهاو نەریتە کولتوورییەکەمان ، تەنانەت گەر هاتوو نرخەکەیشی سست و لاوازێتی ماددی بێت؟ ئەو کێشەیە بەحەماسەتێکی زۆرەوە لە ئەدەبی رووسی سەدەی نۆزدەهەم لە ئارادا بوو لە شێوەی هەڤدیتنی مشتومڕانە لە نێوان بەخۆرئاواییکردن و خولیای گەلدۆستی/ سلاڤیی.

مایەی هەراسانی و ئازاربارییە بۆ ئادەمیزاد گاڵتە بە کولتورە تەقلیدییەکەی بکات، بەڵام ئازاربارترە کاتێ بەو لاوازییە بمێنێتەوە، زۆر کەمیش لە دەوڵەتانی دواکەوتوو نەبێ نەیانتوانی لە دەربازبوون لەو کێشە گرفتاوییە سەرکەوتن بەدەست بێنن، چوون بەرێگەی فرەجۆر مامڵەیان لەگەڵدا کرد، بەڵام ئەوەی مایەی

ئاوڕلێدانەوەیەو مایەی یەکلاکەرەوەیە لە گرنگی و بایەخیدا سەبارەت بەو گفتوگۆیە جەدەلیەی ئێستاماندا بریتیە لەوەی: ئیسلامەتی بەشێوەیەکی نموونەیی پێش کەوتووە تا بتوانین لێی بترازێین و لێی لابدەین.

ئەو هێدمەیەی کاریگەرێتی خۆرئاوا نایەوە (لە دەوڵەتە ئیسلامییە جیاجیاکاندا لەماوەی جیاجیادا بەدەرکەوت هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا تاکو دەگاتە سەدەی بیستەم) ئەو جەمسەرگیرییە توندو چڕەی نێوان هزرڤانە ئیسلامییەکان لە نێوان بەخۆرئاوایی بووان و کۆنە پارێزە نەتەوەییەکان بەهەمان شێوەو نموونەی رووسی نەکەوتەوەو بەدەگمەنیش موسڵمانەکان هەڵساون بە بەنموونەییکردنی کلتورە تەقلیدییە گەلدۆستییەکەیان، ئەوان ئەو خولیا وەهمیە گەلدۆستییەی کە پێیانەوە لکاوە بۆ ئەو ئۆروپیانە جێدێڵن، کە بە فۆرمی نموونەیی لۆرانسی عەرەب فرچککراون، حاڵەتەکە تەکاندەری پەرچەکرداری تەواو جیاوازە و پێداویستی هەنووکەیی ریفۆرمخوازی هەمیشەو تاهەتایە ئامادە لە ئیسلامدا فۆرمی تازەی چالاکی و هێز و چڕیەتی بەخۆدا دەبڕێ، بەبێ گومانیش هەندێ ئەدرێسی تازەو پاڵنەری هاندەرانەی دیکەی زێدەش وەردەگرێ: لەبەرچی خۆرئاوا پێشمان کەوتووتەوە و ئەم مەترسییە لەپڕە هەرەشەدارەش چی پێکدێنێ؟ .

ئەو وەڵامە بەربڵاو و باوە ئاماژە نادات بە پیرۆزکردن و چاولێکردنی خۆرئاوا، یا نموونەگەلێك وەك شتێك لە فەزیلەت و حیکمەتی جەماوەری میللی، بەڵکە گەڕانەوەی پێ قبوولە بۆ شێوەی باڵا لە ئیسلامدا، یا پابەندبوون پێی بەهێزێکی گەورەترو بەدانپیانانی هەموانیش ئەمە بەگریمانەیەکی مێژوویی بەسترایەوە، رەنگە بەگومانیش بێ، کە دەڵێ گوایە شێوەی باڵای زانیار لە ئیسلامدا، جارێ لە تێکڕای کۆمەڵگەدا زاڵ و بلاو بوو، هەروەها هاو جووت بوو لەگەڵ قۆناغی هەرە زووی دەرکەوتنی ئیسلام و دەگەڵ فەرموودەو کردەوەکانی پێغەمبەر و هاوەڵانی. ئەو کارە جێی گومانە، بەڵام هەقیقەتی بێشك ئاماژە بەوە دەدات، کە شێوازی باڵا لە ئیسلام کلتورێکی خۆیی تەقلیدیی رەسەنی تەواویی پێکهێناو کۆمەڵگاکانی پتەوتر بوون و



بنجیان داکوتا، گەرچی لە بڵاوبوونەوە لە نێو هەموو کۆمەڵگەدا سەرنەکەوت و وێڕای ئەوەیش داخوا بەراستی هاوکوف بوو دەگەڵ هەڵسوکەوتی نەوەی یەکەم (یا نەوەکانی یەکەم)ی موسڵمانان یاخود نا؟.

کەواتە خود راستکردنەوەکاریی پێویستی بەوە نەدەکرد بچن بەرەو دەرەوەی کۆمەڵگەو گەڕان بەدوای فەزیلەتێ کە پاکی و بێگەردییە رەسەنەکەی لە نێو قووڵایی رەگو ریشاڵە کۆمەڵایەتییەکەی پاراستووە، چوون دەکرێ بەتەواوەتی گومڕاییەکەی لە رۆشنبیرییە تایبەتەکەیداو باڵا رەسەن و هەقیقەتەکەی بەدەست بخات، ئەمەش رۆشنبیرییەکە لە رابردوودا تەنیا لای کەمینەیەك لەدەست بژێران پیادەکراوە، بەڵام (گەرچیش پیادە نەکراوە) وەکو پێوەرێکی راست و دروست و لەبار لەلایەن توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگە لەقەڵەم دراوە، دەشکرێ ئێستا لەلایەن هەمووان لەدوماهیدا پیادە بکرێ و ئەمەش بەهۆی کارتێکردنی هاندەرو پاڵنەری ئەخلاقی و بەدەنگەوە هاتنێ بۆ وەعزو گوتارە ئایینییەکان، هەروەکو لەسەر رووکاردا وادیارە، یا ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە قووڵە بەربڵاوانەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی هەروەکو هەقیقەت چۆنە، ریفۆرمی خودیش دەکرێ لە ژێر تیشکی ئەوخواستە نوێیانە پێشکەوێت بەو پێیەی گەڕانەوەیە بۆ نموونەی باڵای رەسەنی خۆماڵی، گەڕانەوەیەکی ئەخلاقی بۆ بناوان،و نەك جۆرێك لە رەتکردنەوەی بڕوا و باوەڕی خودی ئوممەت و نکۆڵی لێکردنی.

ئا ئەمەیە ئەو دیتنایەتییەی ئێستا بەهێزی خۆی جیهانی ئیسلامی دەخاتەوە ژێر رکێفی، بەو پێیەی ئایدیۆلۆجیای راستکردنەوەکاریی خودیی و پاکتاوکاریی و دووبارە گەڕاندنەوەی بارودۆخەکەیە، ئەوە چەندین ئاکاری گرنگ و زۆر سەر سوڕهێنەری هەیە، بەلای نموونەی نامۆی خۆرئاوایی داناچێت، بەڵکە پشت ئەستوورە بە نموونەیێ کە بەبێ گومان رەگوریشەی خۆماڵی رەسەن و قووڵی هەیە و دەشێ بەراستی بەر لەهەر شتێك هاوکوف بێ دەگەڵ هەڵسوکەوتی پراکتیکانەی نەوەکانی هەوەڵینی موسڵمانان، بەڵام بەراستیش گونجاوە دەگەڵ ئەوەی تاکە کەسەکان و چینەکان ماوەیەکی زۆر مژدەدەری بوون و پیادەیان دەکرد، ئەوانەی هەر یەکێکیان مایەی رێز

بوون و نموونەی بێهاوتای نۆرماتیڤانە — گەر شیا بڵێین — بوون. لەبەر ئەوە ئەو تاکەی بۆ ئیسلامی ریفۆرمخواز دەگەڕێتەوە، هەروەکو خۆرئاواییبوەکان لە رووسیای سەدەی نۆزدەهەم کردیان، گاڵتە و سووکایەتی بە باوان و کلتورە تەقلیدییەکەی ناکات، بەڵکە تەواو بە پێچەوانەوەیە، دووبارە جەخت دەکاتەوە سەر ئەوەی، کە بە چاکترین رەگەزەکانی نێو رۆشنبیریی خۆماڵی دادەنێ، کە بەشێوەیەکی راستەقینە لە ئامادە باشیدایە، ئەو تاکەیش بۆ ئیسلامی ریفۆرمخواز دەگەڕێتەوە، هەروەها خۆی بەنزیك لە ((گەل)) لە قەڵەم دەدات و نزیك لەوەی ژمارەیەکی بێشوومار لە بۆرجوازای بچووك پیادەی دەکەن هەروەك هەندە جووتیار بە ئومێدن پیادەی بکەن، بەبێ ئەوەی لە هەمانکاتدا خۆی وابەستە بکات بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی بە نموونەخوازی نائاسایی و خۆی لەخۆیدا دوورە دەست بێ لە ژیانی جووتکاریی یا شوانکارەیی، لە هەمانکاتدا گەرچی ئەو نموونە ریفۆرمخوازە لە راستیا خۆییە و سەدای واقیعیانەی لە تێکڕای کۆمەڵگە دەنگدەداتەوە، وەلێ بە زەبرو توندو دژوارو گەلەك خواستیاریشە. ئەو فەرهەنگە نزمە گەلدۆستییەش بەبێ کەموکوڕی یا گیروگرفت سەر زەنشت و تۆمەتبار دەکات، کە دەکرێ، لەگەڵ دەرکەوتنی هەندێ ماقووڵییەت، بەرپرسیارێتی ((دواکەوتەیی)) و زەلالەتی سەپێنراوی خۆرئاوا، بخاتە ئەستۆی سەرزەنشتکارانی. بەردەوامیش شێوە باڵای لە ئیسلامی دەستە بژێر بەگژ شێوە جیاکەی دیکەدا چۆوە بەهەرچی لەخۆی گرتبوو لە جەزبەی سۆفیگەریی و دەرچوون لە رێسا و سیستەم و ملنان بەرەو پێرسۆنالیزم "personalism"، ئێستاش دەکارێ بەهۆی هەندێ بەڵگەو بیانووی تازە بەرهەڵستی بکات، ئەمەش بووە هۆی رێلێگرتنمان! و کارەکەش هەر هەندەیە لادان و وەرچەرخانمان لەو نموونە درەوشاوەیەی پێغەمبەر و موسڵمانانی بەرایی، چێیان کردووە، بەڵام ئێمە بەو کارەمان رێمان خۆشکرد بۆ کافرەکان تاکو زەلیلمان بکەن، کۆلۆنیالیستەکان ئەو هەلەیان قۆستەوە، یا راستتر کاریان کرد بۆ هاندان و وروژاندنی خراپترین لایەن و تایبەتمەندییەکانی رۆشنبیریمان، بەم رێگەیەش پاڵنەری کۆن رووەو ریفۆرم و خود



پاکسازیی ئامێتە لەگەڵ خولیای نەتەوایەتی کارلێك دەکەن، لە راستیدا تادێ جیاکردنەوەیان ئەستەمتر دەبێ .

سۆسیۆلۆجیای ڤێبەر دەمانبات بۆ مەزەندە کردنی هەبوونی هەندێ گونجاویی و هاوکوفیی لە نێوان ئابووریی نوێ و هەرچی پەیوەستە پێی لە بیرو باوەڕ و رۆشنبیریی[٢٣]، ئەگەری ئەوەش هەیە سەمتی تازەی بەرهەمهێنان بەر لەهەر شتێك ((ئەقلانی)) بێت، ئەو سیستمازەکراو و بەمیتۆد کراوە، کاریگەرێتی گوژمەکە بەوپەڕی هێزەوە کاری لێدەکات، خەسڵەتی نەشونماکردنیشی هەیە و تەرخانیش نەکراوە بۆ خۆنوێنی و لە خۆبایی بوون و زێدە مەیلداریشە بۆ دابەشکردنی کارو سوود وەرگرتن لە میکانیزمی بازاڕی ئازاد، هەروەها پێویستە ئەوانەی بەکاری دەخەن، زۆر بەخێرایی بیرۆکەی پابەند بوون و ئەمەکداری بە گرێبەستەکان و خۆشویستنی کاری جیددی ودیسپلین وسیستەمەکە کاریان لێبکات، زۆریش پێویستیشیان بەو تۆڕانەی پەیوەندیەکانی پاراستن ولایەنگیریی ومەیلی سیاسی وئابووریانەی دوور لە ئابووریان نەبێت، توانا و وزەکانیان زۆر لە ئاهەنگ گێڕان و کەرنەڤاڵەکان بەفیڕۆ نەدەن، گەر لەراستیشدا ئەمەبێ خواستی ئابووریی نوێ و گەر ئەمەش سەرباری هەموو شتێ خواستی پرۆسیسی بونیاتنانی ئابووریی هاوچەرخ بێت (رەنگە دەوڵەتی هاوچەرخیش) ئەو کات وادیار دەبێ ئیسلامی ریفۆرمخواز بەگوێرەی مەحەکی زەروورەت و پێداویستیەکانی ساتە هەنووکەییەکە لە مەحەك درابێ، لە واقیعیشداو بەو پێیەی گونجاویی و سازان لە نێوان ئەوەی سۆسیۆلۆجیای ڤیبەرییانە دەمانباتە لای لە مەزەندەکردن و ئەوەی شێوە باڵا شکۆدارەکە و ریفۆرمخواز لە ئیسلام دەیخاتەڕوو، ئەوە لێرەدا شتێك لە ناجێگیریی شێواویانە هەیە لەوەی پەیوەستە بەو هۆیەی رێخۆشکار نییە لە جیاکردنەوەی ئەدای ئابووریی ئیسلامی پەرەستێن بە بەراورد بەبارە واقیعییەکەی، گەرچی باری ئابووریی دەوڵەتانی ئیسلامی پەرەستێن هێندە تەپیو نییە، بەڵام هێندە سەرکەوتوو وگەشاوەش نییە کە مایەی سەر سوڕمان بێت، هەروەها ئەو مشتومڕەی پێشتر بەلای مەزندەکردنیمان دەبات، هەڵبەت ساناش

نییە حوکمێکی یەکلاکەرەوەی کۆتایی دەربکەوێ لەو بوارەدا، لە سونگەی ئەو رۆڵەی سامانی نەوتی هەیەتی لە کارتێکردنێکی شێواویانەی واقیعی کردەنی، بەڵام باری ئابووریی هەرچۆنێك بێ، ناکرێ گومان لە هەقیقەتی باری ئێستاکە لە بواری ئایدیۆلۆجی بکرێ، بۆ نموونە لە خۆرئاوادا، لەسەر وێنەی بارێکی دیاریکراو راهاتووین، کە لەگەڵیا هاوشان بوو حەماسەتی پیوریتانێتی توندڕۆیانە لەگەڵ قۆناغە هەرە زووەکانی سەرهەڵدانی ئابووریی نوێ، بەڵام ئەو لەترۆپکی تەکان پێدانیدا بە کەمتەرخەمییەکی بێشوماری ئایینی ناسرا، ئینجا لە کۆتاییشدا بە عەلمانیەت، بەڵام رۆحی رەسەنی خولیاگەری بەدیهێنانی گەشانەوەی ئابووریی و خۆشەویستی و بەپیرۆزکردنی کار، کە یاریدەدەر بوو بۆ کەڵەکەکردنی سامان، دووچاری داخوران و لاوازی بوو بەهۆی یا لە ئاکامی فریودەرانەی هەمان ئەو دەسکەوتانەی بەدییان هێنا، ئەو بەهایانەی فەزیلەتیش، کە پیوریتانیتی توندڕۆیانە رووانَدی، بوونە هۆی گەشانەوە و خۆشگوزەرانی ئابووریی، کە هەردووك کاریان لەسەر تێکشکانی خودی فەزیلەتەکە کرد، هەروەکو چۆن جۆن ویسلی بە ئەسەفەوە ئاماژەی پێ داوە.

لە جیهانی ئیسلامیدا رووبەرووی بارێکی تەواو جیاواز دەبینەوە، وێڕای ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژ شارستانیەتی ئیسلامی چینێکی بورجوازی بازرگانی ئاراستەیەکی گرنگیشی بەرەو بەشارستانێتی بوون (ئاوەدانکردنی ئاوەدانی)* بەخۆ گرتبوو، وەلێ لەبەرپاکردنی جووڵانەوەیەکی پیشەسازکاریی نوشستی هێنا بەمانا رێکخستنی کۆمەڵگە لەرووی ئابوورییەوە بەپشت بەستن بە پیشەسازی ئامێرسازیی بە پلەی یەکەم، بەڵام کاتێ ئەو قۆناغە پیشەسازییە دەگەڵ پاشکۆ تەواوکارە جیاجیاکانی بەسەری سەپێنرا، جگەلەوەی نەك بەتەنیا ئەو بارگرژییە ئەستەمەی دەریدا، بەڵکە لە هەندێ سوود و دەستکەوتەکانیشی بەخۆگرت، بەڵام ئەو هەرگیزاو هەرگیز بۆ عەلمانییەت وەرنەچەرخا، بەڵکە بۆ پێداگرتنێکی توندی حەماسەتیانە

* یا بە شاریکردنی شاران.



لەسەر شێوازی پیوریتانێتیی توندڕۆ— ی کلتورە تەقلیدییە باوەکەی و رەنگیشە تاکو ئێستا ئەو فەزیلەتە بەو فرەییە گشتاندنە کردەنییەی بەهەند نەگیرابێ، بەڵام لێرەدا کەمێك بەڵگە هەن ئاماژە بەوە دەدەن، کە بڵاوبوونەوەی زۆری و زەوەندی ئابووریی دەبێتە هۆی داخوران و سست و لاوازی پابەندێتی ئایینی، تەنانەت سامانی نەوتی دابەزیویش لە ئاسمانا، کە بە شەکەتی و کۆشش وەدەست نەهاتووە، ئەو جۆرە کاریگەرێتیەی نەبووە.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئایندەدا شتەکان دەگۆڕێن، بەڵام بە گوێرەی ئەو بەڵگانەی تاکو ئێستا لەبەر دەستن، جیهانی ئیسلامی بەروونی دیاریدەخات، کە دەکرێ ئابوورییەکی هاوچەرخانە سازبکرێ، یا بەهەرحاڵ لە رێگەی هاوچەرخێتی، بەشێوەیەکی ماقووڵیش بنەماکانی تەکنەلۆجیا و فێرکردن و رێکخستنی گونجاو، بیسمێت و کار بکات بۆ لە هەمێز گرتن و یەکخستنی لەگەڵ ئیمانێکی بنجداکوتاو و پێداگرتن لە ئیسلام بەهەرچی هەیانە لەهێز و بڵاوبوونەوە و توانادار بۆ لکان بەخوددا، پێشناچێ دینی جیهانی پیوریتانێتیی تێکستەکە وای لەنیوچەوان نووسرابێ بە زەرورەت بە هۆی کاریگەری بارودۆخ و هەلومەرجە نوێیەکان دابخورێت و لاواز بێت، بەڵکە بە پێچەوانەوەی ئەمە پاڵپشتی و پشتیوانیان دەکەن.

## پۆست مۆدێرنیزم و ڕێژەگەرایی

بزووتنەوەی پۆست مۆدێرنیزم، بزووتنەوەیەکی کاریگەری هاوچەرخی بەهێزی تەرز باوە، سەرباری ئەمەش، روون نییە داخوا مەبەستی چییە یا چی دەوێ یا بە تەواوی چ دەنوێنێ، لە راستیدا، روونیی ئەو نیشانە دیارو بەرچاوە نییە لەنێو سیفاتە بە شۆرەتە جیاکەرەوەکانی، ئەو نەك بەگشتی ناشێت پیادەی بکات، بەڵکە جارو بار بەکردەنی نکوڵی لێدەکەن، بەڵام بەهەر حاڵ، وا پێناچێ لێرەدا سی و نۆ روکن لە روکنەکانی بڕواهێنان بە نوێخوازی لەمەو دوایی و لایەنگیریی بۆی و پابەند بوون پێی هەبێت، هەروەها دەکرێ مرۆ راوێژ بە ((مانیفێستی)) ئەو دیو نوێخوازیەتی بکات بۆ وەی لێی مسۆگەر بێت داخوا بەشێوەیەکی لەبار و گونجاو بیروباوەڕەکەی ناسیوە و دەستنیشان کردووە.

رەنگە کاریگەرێتی بزووتنەوەکە لە ئەنترۆپۆلۆجیا [٢٤] وە بدینین و لێی بڕوانین، هەروەها لە توێژینەوە ئەدەبیەکان و فەلسەفە، ئەو دەیەوێت ئەو بوارە مەعریفییانە بە شێوەیەکی زێدە زۆرتر لەوەی پێشوو لێکدی نزیکبکاتەوە، بەڵام ئەو بیروباوەڕانەی ئاماژە دەدەن بەوەی هەموو شتێ بریتیە لە ((دەق)) و ماددەی بنەڕەتی دەقەکانی و کۆمەڵگەکان و نزیکەیی هەموو شتێ بریتیە لە واتای دەلالەتی و واتاکانیش هەن بۆ وەی جفرەیان بکەینەوە یا ((لێکی هەڵوەشێنینەوە)) ئەوە ئەو بیرۆکەیەی واقیعی ئۆبژێکتیڤانە مایەی گومانە — هەموو ئەمانە وا پێدەچێ بەشێك بن لە کەشە گشتیەکە یا کەشی تەمومژاوی، کە نوێخوازی لەمەودوایی تیا دەگەشێتەوە یا یاریدەی بڵاوبوونەوەی دەدات.

سەبارەت بە هەڵوێستی بزووتنەوەکە لە ئاست خودیی مرۆیی، چاك لێم روون نییە، جاروبار وا پێدەچێ لالێکردنەوەیەکی زێدەگۆیانە هەبێت بۆی، بەجۆرێ لێکۆڵینەوەی — ئەنپرۆپۆلۆجی — مرۆڤناسی — کۆمەڵایەتی لە ئاستی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگە لاردەبێتەوە بەرەو تەنیا لێکۆڵینەوەلەمەڕ پەرچەکرداری جیهانی مرۆڤناسی، ئینجا بۆ



پەرچەکردارە تایبەتەکانی و بۆ تەماشاکردنە سوسەییەکانی — کۆمەڵگە، ئەمانەش بەپێی ئەوگریمانەیەی ئەنجامدانی هەرکامیان و لەهەر کاتێکدا بێت.

هەوڵ و کۆشش بە مەبەست و خواستی گشتاندن، لە رووی زانستەوە، بە توندی دوچاری نارەزایی و سەر زەنشت دەبێتەوە بەو پێیەی ((فەلسەفەی پۆزەتیفیزم))ە. پاشان ((تیۆرەکە)) ئاوا دەکەوێتەوە، وەك کۆمەڵە رامانێکی بەدبینانە و پەنهان بێت لە بارەی ((مەحاڵبوونی)) گەیشتن بە ((ئەویدی)) و بە ((ماناکانی)).

جاروبار وا پێدەچێ ئامرازە سیحریەکە نەفیکردن و دوورر خستنەوەی دانەر بێ لەدەق، ئینجا دەستکردن بە ساغکردنەوەی جفرە یا شیکردنەوەی یا داماڵینی شتێ لەو مانایانەی، کە بەدەردەکەوێ دانەر گوتویەتی گەر هاتو پێی زانی.

لەوە دەترسم بزووتنەوەکە و بیروڕاکانی کەمێ زیاتر لەوەی پێویستە بێباری تیابێ، بەجۆرێك ئەستەم بێ کرۆکی بکەوێتە بەر چنگ و بە تەواویش تێی بگەیت، دووریش نییە مەبەستی ئەو هۆشیاریە زرنگەی لەمەڕ بزووتنەوەکە هەڵوەشانەوەی هەموو ماناکان بێت بەرێگەیەك دژە پێکناکۆکە ناتەباکان بخاتەوە روو و تیشك بخاتە سەر ئەو ناتەباییانەی لە ناوەوەی دا هەن یا شتێ لەم بابەتە بکات، وەك هۆکارێکی بەربەست بێ بەراستی تەگەرە بخاتە بەردەم فۆرمەڵەکردنێکی یەکلاکەرەوە ودروست — لەمەڕ هەڵوێستەکەی، بەهەر حاڵ، گەر پێویستە ئەمە بکرێ، ئەوە چاکترە کەسێکی دیکەی جگە لەمن ئەنجامی بدات: من هەست بە ئازادی و ئاسوودەیی ناکەم نە لای ئەو ترۆپکە یا لەو چاڵانەدا، ئەمە ئەرکی ئەو دەستەیەیە ((نا بۆ ئازادی هەڵخەڵەتاندن))، کەمن خۆم بەیەکێك لەوانە دانانێم، بەڵام لێرەدا بابەتێکی دیاریکراو هەیە لەنێو ئەو کۆمەڵە بیروباوەڕانەدا، کە بەراستی تا رادەیەکی زۆر بۆ ئەو گفتوگۆیەی ئێستا بە بایەخە، ئەویش رێژەگەراییە، وا دیارە نوێخوازی لەمەو دوایی نزیکەیی بەو ئەندازەیەی تیا تواناداره بۆ روونکردنەوەکاریی زۆر بە روونی بەلای رێژەیی دایە، هەروەها دژ بە بیرۆکەی تاکایەتی هەقیقەتی بێهاوتایە، تاکو تەرایی، ئۆبژێکتیڤیزم، دەرەکی یا شکۆدار.

هەقیقەت بە پێچ و پەنایە، فرە شێوەیە، گەوهەریە، ناوخۆییە، خودییە... رەنگە هەندێ سیفاتی دیکەشی هەبێت، بەڵام ئەو بەراستگۆیی لایەنگیریان ناکات، بایەخێکی راستەقینە بە رێژەگەرایی دەدەم: چوون بزووتنەوەی پۆست مۆدێرنیزم، کە بە (بیدعە)یەکی رۆشنبیریی پووکاوە دادەنرێ، بایەخی خۆی هەیە، بەو پێیەی نموونەیەکی — میناك — هاوچەرخ و زیندووی رێژەگەراییە، کە لە خۆیدا هەندێ بایەخی هەیە و ماوەیەکی زۆریش دەگەڵمان دەبێ.

جارێك فتغینشتاین لە (فۆرمەڵەکردنی فەلسەفەی یەکەمینی، کە دوایی وەرچەرخا بۆ فەلسەفەیەکی رەفزکراو) وتی: جیهان کۆ دەرەنجامی شتەکان نییە، بەڵکە هی هەقیقەتەکانە، بەڵام لەو کەشە فیکریەی ئێستادا مرۆ هەست بەوە دەکا جیهان کۆ دەرەنجامی شتەکان نییە، بەڵکە هی واتاکانە، هەر شتێك واتایە، واتاش هەموو (هەر) شتێکە و زانستی تەئویلیش (هیرمینوتیکا) پێغەمبەری جیهانی ئەو واتایانەیە و هەر شتێکیش ببێ، ئەوە بەهۆی ئەو واتایەوە دەبێ، کە پێی دەدرێ. واتای بەخشراو بەشتێك، ئەوەیە کە بژاردوویەتی لەو لێشاوە بەراییە لێکجیا نەکراوەی وجود و بەمەش گۆڕیویەتی بۆ شتێکی پێزانراو — درکپێکراو — بەجۆرێك بکرێ دەستنیشان و دیاری بکرێت. (بەڵام ئەو واتایەی تەواوکەری وجودی ئەو شتەیە، هەروەها پێگەو باریشی دیاریدەکات، پاشانیش ئەوە ئامرازێکە بۆ زاڵبوون) دووریش نییە ئەو پێکەوە لکانەی نێوان مەزەبی زاتی و زانستی تەئویل دەگەڵ بەڵێنێکی — ئیحتیکاریی - لەمەڕ خودی باڵادەست رزگاربوو لە رووی ئەخلاقەوە، ئەوەبێ، کە سیفەتی جیاو دیاری بەو سەرپەرشتیکارییە بەخشیبێ، خود تاوێك جۆرێك لە پەناگە، سەنگەرێکی بەرگری دەنوێنێ، تەنانەت گەر متمانەمان بەجیهانی دەرەکیش نەبێ، ئەوە بەلای کەمی دەکرێ متمانەمان بە نەست و بیروباوەڕ و هەستەکانمان هەبێت، بەڵام نا: گەر ئەمە واتا سەپێنراوەکانی سەر ماددەی خاوی سەرەتایی نادیاریکراو بیخاتەوە و واتاکانیش لە کوتلەی رۆشنبیریی خود دژ بەیەکەوە بێن، کەواتە ناتوانین ئەو جۆرە متمانە دارییەو خاڵی راگر لەنێو خودماندا بەدەست بێنین! قەڵا بەرگرییەکەی دیکارت رماو دەستی



بەسەر داگیرا! پێویستە بەو ئەندازەیەی گومانمان لە گفت ولفت و بانگەشەکانی پێشوومان بە زانینی ((ئەویدی)) گومانیش لە خودی خۆمان بکەین، نوێخوازان لە ئەدەب بۆ خود، بۆ تایبەتمەندێتی تەوژمی هۆش وەرچەرخان: بەڵام پۆست مۆدیرینیزمان دەمامکی میکانیزم و فەرمانەکانی ئیندیڤیدوالیزمیان داماڵی و پێگەی رێسا ئۆبژێکتیڤییەکانیان لە نێویدا چێکرد، ئینجا وایان کرد هەموو شتێك جێگیریی لە دەست بدات.

کەواتە، بزووتنەوەکە لەیەك کاتدا خۆی خستە نێو چوارچیوەی سیاسەتی نێو دەوڵەتی و نێو چوارچێوەی مێژووی بیری جیهانی و هەردوو هەڵوێستی بەیەك ناکۆکیش بەیەکەوە بەستراونەتەوە، بەڵام لە مێژووی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بزووتنەوەکە خۆی بە پارچەو بەشێك دادەنێ لە —گوێزانەوەکە- لەوەی حەز دەکا ناوی بنێ، ((پۆزەتیڤیزم)) بۆ تەئویلیەت، هەروەك فاردونیش گوزارشی لەمە کردووە:

{سەرەتای مێژووی وردی بزووتنەوەی ئێستا ناکۆکو ناجورە، بەڵام چاودێران هەر لە حەفتاکانەوە بەسەرەوە دەستیان کرد بە دۆزینەوە... رێسا دامەزرێنەرەکانی مەعریفە بە جووڵەدەکەوتن. هەژینەکانی زەوی.... بە ئەودیو نوێخوازی ناوبران... و... بەجۆرێ درککرا بەو پێیەی چەپکێکە لە گومانە گشتیەکان لە بارەی... نموونە گەلی زانستی رەفتاریی مرۆیی.... سەرقاڵبوون بە دەق و موفرەداتی سەردی زێدەگۆیی لە تەعلیقات.... ئەمانە هەموو ئەو نیشانەدەلالەتیانەن لەمەڕ بزووتنەوەکە [٢٥].}

وا پێدەچێت قوتابخانەی پۆزەتیڤیزم وەکو بلێی مانای بڕواهێنانێك بێت بەهەبوونی هەقیقەتە ئۆبژێکتیڤییەکان و توانستی ساناکردنی و سوود لێوەر گرتنی، سەرباری هەمووان، شیمانەی راڤەکردنی ئەو هەقیقەتانە بەهۆی تیۆرێکی بابەتییانە کە قابیلی تاقیکردنەوە بێت و لە ناوەڕۆکیشەوە بە هیچ رۆشنبیرییەك یا چاودێر یا خوویەکی مگێزانە نە بەسترابێتەوە، ئەوەیشی کە وەکو بەدترین بەلا بەرچاودەکەوێ، ئەو گریمانەیەیە، بەبێ هیچ ئاماژەدانێ بە سەرچاوەی دانەرەکە یا شوناسە کۆمەڵایەتییەکەی، کەهەر تیۆرێك دەکرێ بگوترێ، فام بکرێ و هەڵیسەنگێنرێ.

یەکەمجار کەمکردنەوە لە گرنگێتی خەسڵەتەکانی دانەر — توێژەر ، ئینجا گەر شیا بڵێین سووککردن لە شانوباڵی، هەردووك خەسڵەتی جیاو دیاری ئەو بۆچوونە دەنوێنن.

جا بەم مانایە ڕێبازی پۆزەتیڤیزم بە درێژایی ئەو هێڵە دووچاری کۆسپ دەبێتەوە:

هەقیقەتەکان، ناکرێ لەو چاودێرە جیا بکرێنەوە، کەوای نیشاندەدات گوایە درکی پێدەکاو جیای دەکاتەوە و لەو ڕۆشنبیرییەش، کە ئەو پۆلینکارییە نۆرماتیڤانەییەی پێدەدا، کە بەگوێرەی ئەو وەسف دەکرێن، جا لەبەر ئەوەی حاڵەتەکە ئاوایە، وا چاکترە بۆی لەخۆییمان خەبەردار بکاتەوە، لەسەریەتی دان بنێ بە ڕۆشنبیرییە باوەکەی، بەڵام لێرەدا گەلەك نین لەوانەی ئاگادارمان بکاتەوە، چونکە ڕاستیەواقیعیەکان، سەربەخۆ لەهەرحاڵێکدا لە خود یا ڕۆشنبیریی نەرەخساون ومایەی گومان وراراییىن، ئینجا بەراستی بەشێوەیەك وا بکات ئەوەی دەیڵێ هەزم بکرێ بەورێگەیە لەخۆیمان خەبەردار دەکاتەوە و بەدەگمەنیش ئەو رادەیە دەترازێنێ و گەر ئەو پێشەکییە لۆجیکییانەی بزووتنەوەکەی بەهەند گرت، ئەوە ئەو بەترازانی ئەو ئاستە بەتەواوەتی دەکەوتە هەڵەوە. کارێکە نوشوستی دێنێ لە پێزانینی ئەو گومانە قووڵانەی، کە بە تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی بزووتنەوەکە دادەنرێت.

بەوپەڕی دیققەتەوە سەرنج بدەن، دەکرێ بڵێین لێرەدا دووخاڵی لێکجیا هەن، وێڕای بەردەوام مەیلیان ڕووەو کارلێك کردن و بەیەکداچوون لەگەڵ یەکتریدا، ئەو خاڵەی ئاماژەدەدا بەوەی سیفەتی دیاری ڕەفتاری مرۆیی بریتیە لە تەشەنەکردن و کەماسیی واتا تیایا، جا لەکاتی لێکۆڵینەوە لەلایەن تاکە کەسانێکەوە لە کەلچەرێکدا لەبارەی تاکە کەسانێکی تر کە سەر بە کەلچەرێکی دیکەن، ئەوە پرۆسەکە لێرەدا دوو کۆمەڵە واتای گەرەکە، جگە لەو گرفتەی پەیوەستە بە ڕوونییەکەی و توانستی تەرجەمەکردنی بەشێوەیەکی ئاڵوێرکارانە، ئێمە مامەڵە لەگەڵ ڕاستییە پتەوە بەرچاوەکان ناکەین، کە کوتلە چەمکەییەکەی بە شەفافیەت و نەوروژاندنی ناکۆکی ناسراوە (ئایا ئێمە هیچ کاتێ ئەمەمان ئەنجام داوە؟) دووەمیشیان، ڕاستییەك هەیە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی چاودێریش مرۆیەکە لە گۆشت و خوێن، هەروەها مەزندەو ئامانج و بەرژەوەندی و بایەخ



پێدان و بڕیاری پێش وەختە و خاڵە نەبینراوەکانی هەیە، ئەو شتەی گیروگرفتێکی قەیراناوی دەوروژێنێ، تەنانەت کاتێکیش دەچێتە ریزی هەمان ڕۆشنبیریی ئەوانەی لێیان دەکۆڵێتەوە بە پشت بەستن بە خودی هەمان کۆمەڵە چەمکەکان. لە پراکتیزە کردندا، هەریەك لەو دووانە بەلای پتەوکردنی توانای ئەویدیکە دەشکێتەوە بۆ چێکردنی وەرچەرخانێکی دوو سەرە، بەراستیش لە شتەکەوە بۆ واتا و لە بابەتیش بۆ خود، بۆ جۆرێ لە تەئویلیەتی — نێرگزیانە جیاوادابڕاو نییە.

لە مێژووی جیهاندا ئەو ماوە هەڵکشاوەی پاش جەنگی دووەمی جیهان جگە لەو شتانەی دیکە بە قۆناغی پاشەکشەی پەلهاوێژی کۆلۆنیالی دادەنرێ. واتە: کۆتایی ئەو هەژموونە ستەمبارەی ئۆروپا بەسەر جیهان، کە لە گەڵ گەورە گەشتە دۆزینەوە کارییەکان دەستی پێکرد و لە هەرەتی زووی سەدەی بیستەمیش هەنگاوەکانی گەیشتنە ترۆپك. وایش پێدەچێ بەشێك لەو سیستەمگەلەی ئەو بیروباوەڕانەکە خۆ لەوە دەبیننەوە گوایە هەردوو پرۆسە بەیەکەوە گرێدراون: کۆلۆنیالیزم لەگەڵ پۆزەتیڤیزمدا دەگونجێ و دەرکەوتنی ئیستیعمار — لە گەڵ تەئویلییەت، تاکو لە دوماهییدا لە مۆدێرنیزمی پۆستێرن بگا بە ترۆپك.

پۆزەتیڤیزم شێوەیەکە لە شێوەکانی ئیمپریالیزم، یا ڕەنگە بە پێچەوانەوە ڕاست بێ، یا هەردووك بە یەکەوە، بەڵام ڕاستییە سەربەخۆکان (هەڵبەستراو) و پێشکەشکراو بە شێوەیەکی ڕوون و ڕۆشن، ئەو ئامرازەی هەژموونی کۆلۆنیالیستی و گوزارش لێکەری ئەو بوو، بەرامبەر بەمە سەبگێکتیڤیزم بەو دەلالەتەی ئاماژە دەدا بە گرنگی وبایەخی یەکسانی و ڕێزگرتنی دوولایەنە لە پرۆسەی ڕۆشنگەرایی.

جیهانیش هەروەکو لە هەقیقەتدا وایە (گەر بکرێ بە شێوەیەکی دیاریکراو وەسف بکرێ) لە سەبگێکتیڤیزیستیی نیگەران گرفتاوی دروستکراوە، لە کاتێکدا ڕاستییە بابەتییەکان و گشتگیرییەکان تەنیا گوزارشتگەل و ئامرازی هەژموونکارین!.

دەکرێ بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان گشت ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە بەدی بکرێ وەکو جۆرێك لە زفڕاندنی دەنگدانەوەی جەنگی نێوان کلاسیزم و ڕۆمانسیزم، چوون یەکەمیان

پەیوەست بوو بە هەژموونی تەخت و تاراجی فەرەنسایی لە ئوروپا بە هەموو نەریت و سەمت و پێوەرەکانییەوە دووەمیشیان لەکۆتاییدا بەو پەرچە کردارەی نەتەوەکانی دیکەوە پەیوەست بوو لەگەڵ جەخت کردنە سەر بەها رۆشنبیرییە میللییە تایبەتەکانی[٢٦]. ئەوەندەی ئاگادارم پێشتر ئەو تەریبکارییە نەکێشراوە. سەرباری ئەمەش، تەنیا نەتەوە ئیستیعمارییەکانی پێشوو ئەو رزگارییەیان لە سەردەمی ئێستامان بەدینەهێنا، هەروەها سەردەمی بزاڤی مێینە (فیمینیزم) و ژمارەیەك جووڵانەوەی فرە ڕەنگی دیکەشە، کە کەمینە و گرووپە چەوساوەکان دایانمەزراند بۆ —خودسەلماندن. ئافرەتانیش یەکێ لەو گروپانەن و بەشێوەیەکی تایبەت دەنگێکی بیستراویان هەیە بەمەش (Gender) (جۆری کۆمەڵایەتی)سەرەرای واتاکەی بوو بە دوو چەمکی بەشۆڕەتی دیار، بەڵام رۆمانسییەکان شیعر دەنووسن، پۆست مۆدێرنیزمەکانیش جڵەوی خودیەتی خۆیان بەرهەڵدەدەن، وەلێ نارەزاییان لەمەڕ دیسپلینی سیستەمئامێزو و گوزارشکردنیان لەو نیگەرانییە قووڵەی ناوەوە، لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەکاریی ئەکادیمی بەئەنجام دەگەیشت ئەو بڵاوکردنەوەکارییەش تایبەتمەند بوو بۆ بڵاوکردنەوە لە گۆڤارە زانستییەکان وەکو هۆیەك بۆ زامنکردنی پلە وپایە وەرگرتن لە رێگەی کارکردنە سەر لێژنەتایبەتەکان، لەورووەوە دروشمیان : هەڵچوون و کەفوکوڵ وهەراو هۆریا بوو.

کەواتە لێرەدا بابەتێك زۆر بەربڵاوو دووبارە لە نێو خودی بزووتنەوەکە هەیە ومکوڕانە سوورە لەسەر هاوبەندی نێوان هەردوو کۆمەڵە رووداو، لە نێوان رزگاربوونی سیاسی و سەبگێکتیڤیزمی ئیدراکی، روونیی و پێداگرتن لەسەر- یا، راستر، سەپاندن- راستییەکی تاکلایی و بابەتییانە وەك پێیان وایە بە سانایی ئامرازێك پێکدێنن یا ڕەنگە لە هەندێ دانە-نوسخە-دا ئامرازە چاکەکەی هەژموونداریی بێت. ئەو ئۆبگێکتیڤیزمەی مەبەستییەتی یا لەڕێگەی کۆمەڵناسی تەقلیدی بەر لە مۆدێرنێتە دێتەوەدەست، هۆیەکی نهێنی -نائاشکرا- بوو بۆ سەپاندنی روئیایەکی دیاریکراو بە سەر ئادەمیزاد، روئیایەك ملکەچکەرانی هەژموونگەریی پەلبەست دەکات بۆ ئەوەی بە پرۆسەی ئەو ملکەچ پێکردنەیان رازی بن، بەتەواوەتیش روون نییە داخوا



پێشێلکردنەکە لە سەپاندنی روئیایەکی تایبەتی دیاریکراودا بەرجەستەیە، بەسەر قوربانییەکانی کە جەخت دەکاتە سەر ئەو سیستەمەی هەیە یاخود گوناهی سەرەکی سەپاندنی خودی نموونەی ئۆبگێکتیڤیزمەکەیە و ئایا مەرام و نیاز بۆ ئەو چەمکە لە خۆیدا تاوانێکی بنەڕەتی وسەرەکییە؟.

لێرەدا گرفتێکی دیکەی هاوشێوە هەیە پەیوەستە بە ڕوئیای رزگاریخوازانە، چاکەکاریی، جیاواز. ئایا ئەوە زادەی فرەیی تیۆرەکانە بەجۆرێك وێرای یەکسانێتی، هەموو لێکجیاودابڕاون، یا لە خۆ دوورخستنەوە بەگشتی لەرووی تیۆریزەکردنی ئستاتیکایی و پەلبەست کردنی مەعریفەی کۆمەڵایەتی لە ڕووی تەنیا وەرگرتن، ڕەنگە راڤەکردنی ئەو دەقە ئەتنۆگرافیانەش بێت؟ وا پێدەچێ بزاوتەکە ناجێگیر بێ لە نێوان لایەنی تیۆری کراوەو رەخساو بۆ هەمووان و لە نێوان کۆمەڵەیەکی غەیرە تیۆری یان دژ بە تیۆر لەرووی مانا تایبەتمەندە دەگمەنەکان.

جاروباریش وادێتەبەرچاو کە ئاوا وێنای بکات، کە لە ڕاستیدا بریتین لە کۆمەڵەیەکی لێکدیدووری کۆلاج- ن لە رووی دەستەواژە بەیانییە پوختکراوەکان لەو خەڵکانەی گوێرایەڵی لێکۆڵینەوە و سەودا و سۆراخکردنن و لەو لێکۆڵەرە سەر و سۆراخکارانە، کە بە تەعلیق و توانج تیشك دەخاتە سەر ئازار و ئەشکەنجە ئیدراکییەکانیان.

دیارە هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی بە شێوازێکی ئەوتۆ بخرێتەڕوو ((دیالۆگ ))انە و ((لێکجیا لە ڕووی زمانەوانییەوە)) ناوزەند کراون، کە لە پێشکەشکردنی راستییە تاکڕۆ تاکەکان خۆ بە دوور دەگرێ، دەیگۆڕێ بە فرەیی دەنگەکان — ی جیمس کلیفۆرد، یەکێکە لە نووسەرانی ئەو دەقەی بەکاری دێنم وەکو عەیینەیەکی نموونەیی بۆ ئەو شێوازە[٢٧] لە هەمان کتێب بەم شێوەیە شایەتی پێدراوە:

{شێوازی دیالۆگانە و نموونەی نموونەیی — میناکی —
(برادیگمات)ی ئیستیدلالی، مەیلدارە بۆ پەرتکردن
یا پشککاری دەسەڵاتی ئەتنۆگرافی... نموونەکانی

ئەزموون و راڤە کردن ملکەچی نموونەکانی گوتار یا جەدەل و فرەیی دەنگەکانە}.

هەمان وتاربەردەوامە لەرێی نووسینەکەی ب. رابینو، دەپرسێ ((مەزەبی دیالۆگ چییە؟)) [٢٨]، با لەو لاپەرەی دوایی ئەوە هەڵێنجین ((سیفەتە دیاریکراوەکانی مەزەبەکە هەر بە ناروونی دەمێنێتەوە)) ئەمە راستە، بەڵام بەو پێیەی، کە شێوازی دیالۆگانە مەبەستی لێی ئەوە بوو هەنگاوێ بۆ پێشەوە بێ، ئەوە ئەمە بەجۆرێ کارێکی لە پڕو لەناکاوە . ئەو پێناسەیەشی دیاری دەکات وا دەیخاتەڕوو کە بەرایی لە دیالۆگگەلی روونکەرەوانە، پێکهاتوون، وێرای پێشنیازێك ئاماژە دەدا بەوەی بەلای کەمی نزیکەییە (تەقریبی)، بەڵام پاشان دەستبەرداری بوون بەو پێیەی زۆر سادەوساکارە، وەلێ لێرەدا زێدە لەو ئاشکراکردنە لەناکاوە هەیە، ئەویش ((جیاوازی زمانەوانی))یە، جارێکی دیکەش بەڵگەکە کلیفۆردە [٢٩]:

{جیاوازی زمانەوانی، ئەتنۆگرافیای گلدایەوە... دەستەواژە خۆڕسکەکان بەپێی مەرجگەلێ پەلبەست دەکرێن جیاوازە لەوەی ئەتنۆگرافیا رێکی خستووە... کارێکە پێشنیازی دیتنەوەی ستراتیجێکی دەقئامێزی جێگرەوە، تۆباوی، دەکات بۆ کۆ دانان، کە نەك بەتەنیا پێگەی وتەبێژانی سەربەخۆ، بەڵکە نووسەرانیش دەخاتە پاڵ یا سەر بەشداربووان لە داناندا.........}.

وا پێدەچێ هەموو ئەمانە بەجۆرێ لە هونەری کۆلاج بچێت- دوای چەند لاپەڕەیەك ئیدی لە راستیدا رەوانەی پرۆسەی ئاوێتەکردنی دانراوەجیاجیاکانمان دەکەن، ئینجا دابەشکردنی بە یەکسانی دوای تێکەڵکردنی — لەگەڵ رارایی لە نێوان ئەو تواناداریەی فرەیی دەنگەکان لەرووی بەدوور خستنەوەی لاگیریەتی تۆژەری دەرەکی و لە نێوان گەڕانەوەیەکی دڵارامانە بۆ دانپییانانێ لێوانلێو لە هەستکردن بە خەتا بەوەی خود، دانەر، هێشتاکە لەوێ ئامادەیە، بەڵام دوای ئەوەی ئەو دانەرانە وەك پێدەچێ ئەنجامی دەدەن ئەوە دوورخستنەوەی هەموو شێوەکانی روونیی و ئۆبگێکتیڤیزمە، بەڵام ئەوان لە کۆتاییدا خۆیان لە چەشەی پێشقەرەوڵی هەستکردن



بە خەتا بێبەش ناکەن لە رووی ئەو دواجێماوەی مشەخۆریەتی چاودێرەکە و سەرپێچیکردنی. لە دوماهیدا، وێڕای هەوڵ وکردە و کۆششیان بۆ دەرباز بوون لە میانەی ((دیالۆگ)) یا ((جیاوازیی زمانەوانی)) یا هەر رێگەیەکی دیکە، ئەوان هێشتاکە لەوێ ئامادەن. مەبەست لەو هەموو داهێنانە شێوازگەریانەش ئامادەگێتیی — موخبیر —ە بۆ نێو جەرگەی کتێب، بەبێ ئەوەی تەفسیری تەئویلی بیشێوێنێ: بەڵام ئەمە درککردنێکی تاوانکارانەی دڵویستانەی بە دوادا دێت بەوەی دانەر ((یا دانەران)) وێڕای هەر شتێك هێنایانەوە ئەوێ لەرووی ئەوەی یاریدەی دەسەڵاتیش دەدا بۆ تەفسیرکردن، چارەسەر، پەنایەك نییە و دانەرانیش بەراستی حەز ناکەن لەگرێی گوناهیان دەرباز بن، چوون وا پێدەچێ هەست و نەستیان بەمە دەگاتە ئەوپەر ئاستەکانی رەزامەندی و چێژ وەرگرتن.

تارادەیەك مەحاڵە پێناسەیەکی یەکدیگیر یا وەسپێکی راپۆرت ئامێز بخەینە ئەستۆی پۆست مۆدێرنیزم، خوێنەریش ئامۆژگاریی دەکرێ بە دەستنیشانکردنی ئەو دوو بڕگەیەی رابینۆ لەو کارەی نووسیبوونی و ئێمەش وەکو سەرچاوە [٣٠] بەکارمان هێنا، کە لە راستیدا بە پرسیارێك دەست پێ دەکات ((نوێخوازی لەمەو پاشی چییە؟)) ئەوەی مرۆ دەکرێ بیلێ ئەوەیە جۆرێکە لە هستریای ئیندیڤیدوالیزم، کە بۆ ئەو دیوی ئەو نخوبانە دەچێت، کە هەریەك لە ((جۆیس و هەمەنگوی و وۆلف و ئەوانی دیکە)) پێکاویانە، ئەوانەی وەك دیارە پڕ بە پێستی خۆی زێدە ڕەوییان نەکردووە و دوور نەکەوتوونەتەوە: ((حەز و تاسەیان چاو دەخاتە سەر ئیندیڤیدوالیزم ی ناوەوەونوێندە و جیاواز... لە قسەی ئاسایی و خود هەڵێنجراوە و لە لە یەککاتدا لەسەر مەودایەك لەوانەوە وەستاوە)) واش پێدەچێ ئەمە بە کارێکی رێکخراو و میتۆدییانە تا رادەیەکی پەسەند نەکراو دادەنرێ، بەڵام لەکاتی هەنگاونان بەرەو دوور تر ئەوە وا دیاردەدات مرۆ دەگاتە خاڵێکی دیاریکراو بەجۆرێ بارکدگرژی نێوان حاڵەتی ئاسایی و نوێخوازی (ئاوها) لێکدەترازێ و ئەمەش لەکاتی دەستبەردار بوون لە ((گریمانەی... هەبوونی شوناس و پێوەرە زمانەوانییە جێگرەکان بەشێوەیەکی رێژەیی)).

ئەو مەبەستە ناگاتە پلەی روونیی — زاراوەکانی رەخنەی ئەدەبی میتافیزیقی پۆستیزم گفتی ئەمەمان پێدەدا — بەڵام تیۆرەکە، لەخۆیدا پاشەوپاش لەهەمان سەرچاوەی شێوازەکەی خۆی دەخواتەوە، کە لەگەڵ لێڵایەتی و پەنهانییەکەی گونجاوە: هەمان گۆشەنیگا گەرەکیەتی دەستبەرداری ((پێوانە زمانەوانییەکان)) بێ و بەپێی دۆزینەوە تایبەتیەکانی بئاخڤێ. واتاکەی لە ئەدەب لام مەبەست نیە، بەڵام لە ئەنترۆپۆلۆجیادا ئەو لە واقیعدا مەبەستی دەستە بەرداربوونە لەهەر هەوڵدانێکی دڵکارانە بۆ پێدانی وەسپێکی ماقووڵ و ورد و بەڵگەدار و قابیلی تاقیکردنەوە لە بارەی هەر شتێك. بەو پێیەی زانکۆکان بەکردەوە پسپۆرانیان دابین کردووە بۆ شلۆڤەکردنی هۆی مەحاڵبوونی مەعریفە (لە بەشەکانی فەلسەفە)، هەروەها ئەمەش نادیارە کەوا لەبەرچی لەسەر بەشەکانی مرۆڤناسی پێویستە ئەو ئەرکە دووبارە بکەنەوە بەرێگەیەك، بەجۆرێك دوور لە لێهاتوویی و لێزانیەکی سەددەرسەد .

دوماهی، وا پێدەچێ واتای پراکتیکی ئەودیو نوێخوازی لە بواری ئەنترۆپۆلۆجیادا لە شتێکی ئا ئاوادا نزیك ببێتەوە: رەتکردنەوەی (هەرجۆرە هەڵبژاردنێك لە پراکتیزەکردندا) بۆ بڕیاردان لەسەر هەر هەقیقەتێکی ئۆبژێکتیڤانە و هەر بونیاتێکی سەربەخۆی کۆمەڵایەتی، لەبری ئەوان کۆشش بەردەوامە بەدوای ئەو ((واتایانە))ی پەیوەستن بە بابەتگەلی تۆژراوە و لێتۆژراوە هەردووکیان، بەمەش لێرەدا پێداگرتنێکی چەند بارە هەیە لەسەر ئیندیڤیدوالیزم: جیهانی ئەفرێنراو لەرێی کەسی کۆڵینەوە لەسەر کراو و دەقی ئەفرێنراو لەرێی تۆژەرەوە، بەڵام ((واتا)) ئامرازێکی شیکەرەوە نییە بەقەد ئەوەی بیرۆکەیەکی چەمکئامێزی مەستکراوە، هۆیەك بۆ ختوکە دانی خود. لێکۆڵەر/تویژەر ئاوا دەستپێشخەرییەکەی بەدەردەخا بۆ ناسینی نهێنییەکانی زانستی تەئویل و سەرسەختیی پرۆژەکە لەیەککاتدا، ئەمەش بەهۆی شێوازێکی پەخشان ئامێزی پێچاو پێچی و ئاڵۆز و کۆمەککراو بە ئاماژەگەلی توندوتیژانە لەرووی ئەو پێگە شیاوەی دانەرانی هەرە مەزنترین سەد کتێب لە جیهاندا، سەرەرای کتێبی ((بانکی چەپ))ی نوێترین تەرز. بەڵام ئەو ناوە بەکارهاتووانەی سەرچاوەکان بەگشتی



بۆوە دەگەڕێتەوە وەکو بلێیی لە نەخشەی میترۆ پاریس کۆپیکرابن، ئەو وێستگا بچووکانەی سەر رێگای بوردەرلیان و ئەو پەرتبوونە بێبارە لە ناکاوانەی دێنەئاراوە بە یەکێك لەو رێگایانە دادەنرێ، کە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی ئەو نوێخوازییە لەمەو پاشە گەیشتە ئەو دیو ئیندیڤیدوالیزمی تەوژمی هۆش ناسراو بە میتۆدی رێژەگەرایی، هەروەها پراکتیزەش کراوە بەو پێیەی بەشێکە لەو چوارچیوە نوێخوازە کەونە تەرزەکەی جۆیس یا بروست یا وۆلف.

زۆر بەتوندی جەخت دەکرێتە سەر ئەوهاوبەندیەی یەکسانێتی سیاسی و تەئویلیەت بەیەکەوە کۆدەکاتەوە و بەراستیش وا پێدەچێ سەبارەت بە بەشداربووانی بزووتنەوەکە ئەمە کارێکی بەدیهیبێ ، لە رۆژگاری ئیمپریالیزم یا دەسەڵاتی پەتریارکەکان یا هەردوو پێکەوە فەرمانرەواکان (کۆلۆنیازمەکان یا پەتریارکەکان یاوەکو وایە کۆلۆنیالیزمە پەتریارکەکان) دەسەڵاتیان بۆ سەپاندنی روئیایان بەسەر قوربانیانیان بەکار هێناوە، روونتر ئەو روئیاودەسەڵاتەیان بەکارخستووە بەمەرامی بەدەستهێنانی دەسەڵات یاخود وای لێبکرێ -دەسەڵاتەکە-لە ئارامی وئاسایش دابێ، ئینجا وەهمی شەرعیەتەکەیان بەسەر قوربانیەکانیان سەپاند، گوایە ئەوان تەنیا و تاکو تەرا هەر کۆیلەیان ناوێ، بەڵکە ئەو کۆیلانەی ملکەچ بوونیان بەناوی ئۆبگێکتیڤیزم دەنوێنن و دەشێرنەوە، دەشکرێ مرۆ ئەنجامی هەموو ئەمانە بە وتەیەك پوخت بکاتەوە : تێکڕای بیرۆکەی ئۆبگێکتیڤیزم و روونیی بە سانایی فریودانێکی فێڵبازانەیە، کە کۆلۆنیالیزمە دەستڕۆیشتووەکان دایانڕژتووە. دیکارت بە ئاسانی شانۆکەی بۆ کیبلینگ ئامادەکرد، کەواتە دیکارت، ئینجا کیبلینگ، ئەگەریش ئەو نەبا ئەمیش نەدەبوو، ئازادی لە شێوەی غموزێکی فرەلایی — لۆجیکیانە- شیاو دووبارە خۆی دەردەخاتەوە و دژایەتی کیبلینگ واتە نکولیکردن لەدیکارت. لە راستیشدا، دیکارت، ئەو کەسەی دەروازەیەکی لێبڕاوانەی لەمەڕ داواکردنی هەقیقەتی بابەتیانە (objectivity) خستە سەر پشت، کە تخوبەندە روناکبیریەکان بۆگەنیان نەکرد بوو، دیکارت بوو ئەو ئەقڵەی ((داب و نەریت و نموونە-میسال-)) (بەپێی گوزارشە تایبەتەکەی مانای رۆشنبیرییە)

گەندەڵی نەکرد، ئەو بوو چەك و ئامرازە چەمکئامێزە پێویستەکانی زاڵییەتی ئیمپریالیزمی پەرترپارکی لە سەر زەوی، دارِشت. دیکارت وای دەرخست گوایە کۆجیتۆ وەکو پێشەکییەکی لۆجیکیانە، بۆ خۆ دوورخستنەوە لە تخوببەندە روناکبیرییەکان، دەکرێ بەکار بهێنرێت. دوای سێ سەدەش جارێکی دیکە بە زەبر و زەنگەوە وەکو ئامرازێك لەمەرِ جێگەورێگەوجەختکردنەوە جارێکی دیکەش دێتەوەئارا وەك تاکە هەقیقەتی واقیعیانە .

دوور نیە ئەو دیتنە لە میانەی زنجیرەیەك بنەچەوە پەیوەست بێ بە چەندین تیۆری فیکری، وێرِای ناوێزەیی ئەو تەرحەش یەکێکیان خۆی لە مارکسیزم دەبینتەوە. هەڵبەت ئاواش جۆرێك لە جیاکاریی وەهمبارانە وەك دژیەکیەتی رووالەتییانە دەمێنێتەوە، بەو پێیەی مارکسیزم بانگەشەی ئەوە دەکات کە ((ماتیریالیە)) و دەربەستە لە دیتنی ژیانی کۆمەڵایەتی بەجۆرێ بەرایی دەدا بە هێزی ماددی بەرهەمهێنان، بەمەش ئاوا مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵەی واتادا دەکات وەك شتێکی نا سەرەکی و داتاشراو. بە شانازیشەوە بانگەشەی ئەوە دەکات، کە ((زانستیە))، لە واقیعیشدا خاڵی کۆتایی پرۆسەی پراکتیزەکردنی زانستە بە سەر کۆمەڵگە و کێشە ئەخلاقییەکان .

بە تەئکیدیش بانگەشەی ئەوە دەکا، کە خودان هەقیقەتی بابەتییانەیە، رەنگە ئەمەش لە راستیدا گۆشەنیگا ئۆرگیناڵەکەی مارکسیزم بێت، کە گەر شیا بڵێین لە پصەرچەکردارێکی لە ناکاو و سەرسورِماوانەی دژ بە ئایدیالیزمی هیگلی لە دایکبوو، کە ئەوکات ئەویش خودان زمانێکی جیای زاراوەیی بوو، گەرچی ئێستاش بەهەر جۆرێ لە بیرکراوەو تەرزێکی کۆنە، ئەوە جیهانی ئاوا راڤە کردووە بەو پێیەی بەرجەستە کردنێکی رواڵەتییانەی واتاکانە و مارکسیزمیش دەستی کرد بە داهێنان و نکوڵیکردنی لە هەموو ئەمانە و پێشکەشکردنی واتاکان وەکو سەدایەك بۆ هێزە بابەتییەکانی هەقیقەت، بەڵام ئەمە بۆ ماوەیەکی زۆر پێشتر دەگەرِێتەوە، لە بەرەبەیاندا ئەوپەرِی بەختەوەری تیا بوو سەبارەت بەوەی هەر لە ژیاندا بێت، ئیدی ئاوێکی زۆریش لەو کاتەوە بە ژێر پردەکەدا رەت بوو. تایبەتمەندێتی رەهاکاریی —



(تاکوتەراکردنی)ی دۆزینەوەی مارکستی لە مەرِ هەقیقەت بەخراپ شکایەوە، هەروەها، ئەو رێگەیەی گرتیەبەر لەرووی پێشکەشکردن و بە نەمرکردنی، مارکسیستەکان بەردەوام بە سووك وسانایی متمانە بەوانە ناکەن، کە راوبۆچوونی ئەوانیان بە دڵسۆزی و نیەتپاکی قبووڵ وپەسەندکردووە. سەرباری ئەمە، دەبوایە بەگوێرەی تیۆرە تایبەتەکەیان پاڵنەرەکانی ئەو کەرتخوازە سۆسیۆلۆجیانە تەفسیر بکەن، هەڵەکە هەرەمەکی نییە، بەڵام لە رووی کەمەڵایەتیەوە وەزیفییە: چوون سیفەتەکانی وەزیفەکەی هەر بەهێندە ناوەستێ تەنیا بە دیاریکردن و ریسواکردنی کەسی کەرتخوازو ( بیدعەخواز - موهەرتەق) بەڵکە دیمەنە کۆمەڵایەتیەکەش رۆشندەکاتەوە. راوبۆچوونە هەڵەکانی دوژمن تیشك دەخاتە سەر پێگەکەی وئەو بەدکارییە کۆمەڵایەتیانەی، کەگرنگی بە داکۆکی لێکردنیان دەدات، هەروەها ئەو ئامرازە رەخساوانەی لای بۆ بەدیهێنانی مەرامە دزێوەکانی، کار و کردەوەکانی تۆمەتبارکردن و دووزمانی (غەیبەتکردن) و ریسواکردن. ئەمانە پەروەردەو فێرکردن بوون، هەروەها چێژ وچەشەیەکی دڵشادانەش بوون.

مارکسیستەکان بەخێرایی، چەژەی بەهێزی ئەو جۆرە راڤەکردنە داشۆریانەیان وەرگرت، سەرباری لێهاتوویی و کارامەییان تیایە و تەفسیرکردنی وەلانانی رای رەخنەگرانەش، لەوەی پەیوەستە بە ئەزمونی چینایەتی و بایەخدانی رەخنەگر، بوو بە شێوازێکی ئەدەبی رەگداکوتاو، رێسای بریار لە سەر دراوی خۆی و کلاسیکیات و هەنگاوە بەراییە کاررِاییەکانی خۆیشی هەیە و لەگەڵ رەتبوونی کاتیشا، نەخاسمە دوای رسکان و دامەزراندنی یەکێتی سۆڤیەت، قەوارەی رەخنەی نەیار — ئەوەی مەبەست لێی دوورخستنەوە بوو بە شێوەیەك بەردەوام ئاشکراو و روون بۆوە — بەرەو خراپی دەچوو، و دەهەمبەریش رێژەی مارکسیستەکان زیاتر دەبوون، ئەوانەی پێکهاتبوون لەو تەفسیراتە تۆمەتبارکەرانەی دژە رای مارکسیزم، تارادەیەك مارکسیزم بوو بە جۆرێك لە بابەتێکی تایبەت لەو جیهانەی خۆی لە گومرِایی روناکبیریی دەستە جەمعی و ستراکتۆرە پێکهاتەییەکانی جیهانی ئەوانیدیکە دەبینتەوە .

هەموو ئەمانە لە دوو لایەنەوە پێچەوانەی ئەو بزووتنەوەن، کە ئێستاکە مەبەستمانە : هەڵوێست، لە ئاست داهێنانەکانی جیهان ئەوانەی لە ژێر لێکۆڵینەوەدان، تارادەیەك خراپە (نەرێ)یە و چاودێر نییە بە سەریەوە، لێرەشدا دوو شت لەو راستیە بێهاوتاو بابەتیە مانەوە، کە پێویستە پشتڕاست بکرێنەوە — وێڕای قەوارەی ئەو گرنگیدانەی ئەو جێماوەیەیبەخۆوەی گرت زۆر بە خێرایی کزوسست دەبوو، بەڵام دەرەنجامی سەیری ئەمانە لەوە خۆی دەبینتەوە مارکسیزم چووە پاڵ یا تا رادەیەك رووەو سەبگێکتیڤیزمی مێژوویی نەك ماتریالیزمی مێژوویی، چوون پیادەکارانیان تا رادەیەکی زۆر پسپۆرگەلی لێهاتووی ئاوایی بوون بۆ رەخساندن وئامادەکردنەوەی فرت و فێڵە خەڵەتێنەرە فەلسەفییەکان، کە ئۆبگێکتیڤیزم رەتدەکاتەوە. هەندێ جار ئەو دابە بە سانایی بە سەر هەمواندا باڵدەکێشێ تەنها ئەو نەبێ.

ئەو خولیایە بەگشتی فرە گەشەکردنی بەخۆوە بینیوە بە هۆی ئەو بزووتنەوە کاریگەرەی، کە چیدیکە بە کۆمۆنیزمی نێو دەوڵەتی نەبەستراوەتەوە، لە پاشیشدا خۆی لە هەر پابەندییەك ترازاند لەرووی داکۆکیکردن لە تۆماری مارکسیزمی پراکتیزەکراو — بزووتنەوەی فەلسەفی ناسراو بە ناوی فێرگەی فرانکفۆرت، ئەوەی کە بە ((تیۆری رەخنەیی)) کە ناو دەبرێ خستییەروو. ئەمە لەخۆیدا نموونەیەکی شێواز ئامێزی بە هەموو مانای وشەکەوە نواند بۆ بزووتنەوەی رزگاریی ئەنتلجنسیای چەپرەوی نێو دەوڵەتی لە دەسەڵات و سیستەمی پارتی کۆمەنیست، کە دوای گرێدانی کۆنگرەی بیستەمی پارتی کۆمەنیستی سۆڤیەتی و ئەوەی خرۆشۆف لە میانەیدا چەند هەقیقەتێکی ئاشکرا کرد، بە دەرکەوت. هەروەها کارە پرۆتستۆییەکانی قوتابیان لە شەستەکاندا بەشێکی زۆری خستە سەر ئەو ئایدیۆلۆجیا پێویستەی رەخنەگرتن لە هەردوو ئۆردوی زاڵبووی ئەو کات بە سەر جیهاندا.

فێرگەی فرانکفۆرت، مارکسیستە پابەند بووەکانی حزبی لە رووی توندی کارتێکراویان بە تەفسیرکردنی وەلانانی رای بەرهەڵستکارانی، چوواند، بەڵام لێرەدا



جیاوازییەکی بە بایەخ هەیە. چون مارکسیستە کۆنە پارێزەکان لە خۆیدا بەرهەڵستی بیرۆکەی مەوزوعییەتیان نەکرد، بەڵکە هەر هێندەیان دووپات کردەوە کەوا بەرهەڵستکارانیان لەوە شکستیان خوارد تا بە شێوەیەکی راستەقینە بێن بە بابەتییانە، تەنیاش بە پێوەند بوون بە پێوەرە بابەتییە زانستییەکان خۆیان نیشاندا، لە کاتێکا ئەوان لە واقیعدا خزمەتی خولیاوخواستە چینایەتیە تایبەتییەکەیان کردووە، کە لە هەمانکاتیشا لە رێگەی لاداون، وەلێ زانستی راستەقینە هەرمایەوە و جیاوازیش لەگەڵ هۆشیاریی قەلپ — ساختە — ی ژێر رکێفی کاریگەریی خواستە چینایەتییەکان. بەڵام لەوێدا لە هەڵوێستی مارکسیستە کۆنە پارێزان، وەفادارە توندڕۆکان، گەر شیا وابڵێین، بەرچاو دەکەون، دەلالەتێکی وریاکەرەوەی ئەوەی کە دێت و ئەمەش بەقەد ئەوەندەی لەتوانایان دابوو جەخت بکەنە سەر هەقیقەتی، کە وابەستەیی تەنیا بە سیستمی زانستی کارڕایی ((فەرمی)) بەس نییە، بەڵکە ئەوە لە راستیدا شێواندنێکی خەڵەتێنەرانەیە: جا ئۆبگێکتیڤیزمی راست و دروست سەرباری هەموو شتێ، چینێکی دروستی جێگر و پێگەیەکی سیاسی گەرەکە. زۆریش ئاسان نەبوو داکشان لەم رایە بۆ ئەوەی دیکە، کە دەڵێ پێگەی دروست لە خۆیدا بەسە و دوماهیش بۆ ئەو رایەی ئاماژە دەدات بە ببڕای ببڕی نەبوونی پێگەی بابەتیانەی "جێگیر و دروست" ئەوە ئەو سەر لێشێواویە ڕاستەقینەیە لەبیروبڕوادا بەهۆی توانستی هەبوونی حەقیقیەتێکی بابەتیانە، گۆڕانی بەسەرداهات. بیر لەسەر واتاکاندا دەژیت و واتاکانیش بەڕۆشنبیریی سنوردارن. ئینجا ژیان زاتیە. کەواتە، ناکۆکی و جیاوازی لەمەڕ ڕێزگرتنی مارکسیستە کۆنەکان بۆ ئۆبگێکتیڤیزم لەخۆیدا، گۆڕا و وازیان هێنا لە تۆمەتبارکردنی بەرهەڵستکارانیان گوایە نوشوستیان هێناوە لەرووی پیادەکردنی بەشێوەیەکی گونجاو، سەرەڕای پێشێل کردنی بنەماکانی لەو ئان وساتەی مەرامیان نزیکبوونەوە و لایەنگیری کردن بوو لێی، بەڵام ئەوەی خودان فێرگەی فرانکفۆرتی جیاکردەوە بریتی بوو لەوەی، کە خولیای رەخنەگرتن لە پڕۆسەی وابەستەگی بەحەقیقەتی بابەتی و لاکردنەوە لێی لەخۆیدا، ئیدانەکردنی ئەو تەنیا بەو پراکتیزەکردنە هەڵبەستراوەی خۆنابینتەوە. چوون

پارێزگاریکردنێکی وردی فۆرمالیزمی میتۆدیانە و جۆشدانێکی زێدەڕۆییانەی ئەستەم، ئەو هەوڵەیان بەرجەستە کرد، بەڵام لەژێر پەردەی تۆژەرانی - بێگەرد و پاکیی لەرووی بەرەواییکردنی ئەوەی هەبوو و ئەمەش بەهۆی ئاماژەدان بەمەحاڵبوونی هەبوونی ئەلتەرناتیڤێکی دیکە [٣١].

هزرڤانی ڕەخنەگری ڕۆشنفکر و ڕاستەقینە(بەگوێرەی فێرگەی فرانکفۆرت) ماوەیەکی زۆر لەبەرچاوان ون نەبوو، بەڵکە ڕاستتر هیچ کاتێ بیروبڕوای نەڕەویبۆوە لەدۆزینەوەی سەد دەرسەد چی بووە، بەڵکە ڕاستەوخۆ هەنگاوی نا رووەو ماددەی شاراوەی پەنهانی ژێر ڕووکاری، بەرەو بنەما قووڵەکان چوو، کە ڕاڤەی هۆی ئەوەی کردووە کە بووە، سەرباری ئەو ڕۆشناییە حەشاردراوەی رووەو ناخی چالاییێکی قووڵ و هاوزەمان پەیوەست بەوەی کەپێویستە ببێ و بەبێ چوونە ژێر ڕکێفی کۆیلە باری پەیوەست بوونی هزرڤانی پۆزەتیڤەتیست بەو شتەی بوو، کە وەلانانی تەنیا بڕیاڕدانێکی شێواوونادروستانە بوو، کە ڕەوشە باوەکە جەختی لەسەر دەکاتەوە، هزرڤانی حەقیقی ڕەخنەگر، بەڕۆحە ڕزگاربووە ڕابووەکەی، خۆی لەپێگەی باش بینیەوە بەجۆرێك زەوینەی بۆ دەرەخسێنێ لەمەڕ دیاریکردنی ئەوەی پێویستە دەبێ بەتەواوەتی ببێ، ئەمەش تەنیا لە بەگژاچوونی جەدەلیانە لەگەڵ ئەو شتەی بوو، ئەمەیە ئەو ڕۆژە بەتاڵانەی "پۆزەتیڤیزت" کاتێ هزرڤانێ بوو ڕاستیەکانی دژ بە مارکسیزم دەهێنایەوە گۆڕێ، بەڵام ئەمڕۆ ئەو هەرکەسێکە کە سوود لەو ڕاستیانە دەبینێت جا هەرچیەك بن یان ڕێدەدا بەهەبوونیان، وێڕای ئامانجی مەبەستداری خۆی.

ئائەمەیە لەناوەڕۆکدا بیروبڕوای شۆڕشەکانی قوتابیان، کە لەشەستەکاندا بەرپابوو و بەتایبەتیش ساڵی ١٩٦٨ و بابەتی ئادەمیزادی فرانکفۆرت خودان بیروباوەڕی ئەوتۆ بوو میانڕۆ لەڕووی ڕوونی و هاندان و وروژاندندا، وێڕای ئەوەی هێندەش ئۆرگیناڵ نەبوو لەوەی پەیوەستە بەوهۆیەی، کە لە سەرئادەمیزاد پێویستە زۆر نەچێتە ژێر ڕکێفی کۆیلەباریەتی ئەوەی هەیەولەئارادایە، چوون لایەنگرانی بڕوا دێنن بەوەی فرەیی زۆری و زاڵیەتی گوتەی "کۆتایی ئایدیۆلۆجیا" بەسەر مگێزی باو لەماوەی دوای جەنگ تەنیا



هەوڵدانێك بوون بۆ دابڕانی سیفەتی ڕەهایەتی بەسەر ئەوەی هەبوو و نکۆڵیکردن لە هەبوونی هەرشتێکی دیکە، بەڵام ئەوەی ئەو لایەنگرانە نەیانبوو یاخود بەڕاستی هەیانبوو و سەرسوڕهێنەرانەش سەرکەوتن لەهێشتنەوەی بەشێوەیەکی نهێنی و شاراوە، ئەوەیە هەر میتۆدێك هەرچەندە لە دیقەت یا هەر ڕێگەیەکی ماقووڵ یاواقیعی و یەکدیگیر بێبەش بوو بۆ دیاریکردنی یا ئەو ڕاستیە ڕەگاژۆ پەنهانەی ژێر ئەو ڕاستیە ڕواڵەتیانەی، کە "پۆزەتیڤیست"ە گومراکان بەلای دادەچوون یا پێناسەکردنی هەر شیمانەیەکی کۆمەڵایەتی جێگرەوە دەبێ بخرێتە بەردەم واقیعی ئێستا وەکو نمونەیەکی میناکی هەرە چاکتر و واقیعی. جا وێڕای هەموو شتێك، لەوێدا ژمارەیەکی بێکۆتایی لەو تەفسیرانە شیاوە قووڵانە هەن لەمەڕ ئەوەی لەسەر ڕووکاردا هەیە (ئەگەری ئەوەش لەئارادایە ژمارەکەی لای تۆ زیادبکات گەر هزری بیرۆکەی بەگاڵتەزانینی ڕاستیە ڕواڵەتییەکانت کردبێت و تۆش تەنانەت بەکاکڵی ئەو ڕاستیانەت نەدەزانی) بەهەمان شێوە، لێرەدا ژمارەیەکی بێسنور لەو جیاوازیانە یا دژیەکی شیاو حاڵی حازر هەن، هەندێ لە ئێمە  هەمووانی لەواقیعی هەنووکەیی پێ باشترە، ئادەمیزاد داخوا چۆن ئەوەی ڕاستە لێی دەبژێرێ؟ وەڵام ئاماژە بە بوونی هیچ ڕێگەیەك نادەدات. لە پراکتیزەکردندا، خودان فێرگەی فرانکفۆرت و لایەنگرانی کاریان لەسەر ڕێبەخۆدان کرد بۆ بەدیارخستنی ئەوەی ئاشکرای دەکەن لەڕاستیەکان یا (حدوس)ی تایبەت بەوەی پەیوەستە بەهەردوو قووڵیی و نموونەیی، ئەمەش دوای ڕزگاربوون لە هەر شێوازێکی پۆزەتیڤیستانە بۆ پشکنین و گەڕان بەدوای ڕاستی بەهەرچی گرتویەتیەخۆی لە رووی شەکەتبوون و ڕواڵەتیانەیی.

لەمیانەی پایەدارکردنی بەهای تەواوکاریی ئەو سیفەتە - قووڵیەی - بانگەشەیان بۆی کرد (دەستەواژەی لەباری کارل پۆپەر بۆ پایە)، بەڵام ئەلتەرناتیڤەکە بریتیە لە پەنابردنی بۆ شێوازی شێواندنێکی خەڵەتێنەر و فرتوفێڵی جادوگەریانە و زێدەگۆیی، بەڵام ئەوان بەلای کەمی وایان دەرخست، کە بۆ ئەنجامدانی ئەمە ئەلتەرناتیڤێکیان هەیە، پاشانیش مەراییکاری نمونەی بابەتیانە و میتۆدیانە بوون، تەنانەت گەر

لەپراکتیزەکردنیشدا خەتایان دەرهەق ئەمە کردبێ، چوون "میتۆدی ڕەخنەگرانە" نییە، بەڵام بانگەشەکردنی بەکردەیی هەبوونی تەنیا نرخێك بوو سەبگێکتیڤیزم دەیدا بۆ مەرایی و پیاهەڵدانی ئۆبژێکتیفیزم .

بانگەشەکارانی پۆست مۆدێرنیزم لەسەر هەمان ڕێچکە بەردەوام بوون ئەو پێگانەی پێشتر لەلایەن کۆنە مارکسیستەکان و فرانکفۆرتییەکان، کۆنترۆڵ کرابوون، وێڕای ئەوەش ئەوە مانای پەیوەندیکردنێکە بە بنەچەکەوە (النسب) بەگوێرەی زێدەڕۆیکردنیان لەو پێداگرتنە توندە لەسەری [٣٤]، فرانکفۆرتییەکان ئامانجێکیان بەمەبەستی ئاراستەکردنی ڕەخنە و سەرزەنشتەکانیان هەڵبژارد، ئامانجەکەش لەو شێواندنە دیاریکراوەی ئۆبژێکتیڤانەی ریالیستانە بەرجەستەنەکرابوو، بەڵکە لە خۆیدا پەیوەست بوونە بە ئۆبژێکتیڤست، ئەمەش سەرچاوەی شێواندنە و ئەرکیشیان ڕاستکردنەوەیەتی، تکایە بە ڕاستیە ڕواڵەتیەکانەوە پەیوەست مەبن، بەڵام ئەوان لەسەر هەمان پێگەی ئەلتەرناتیڤ دروست مانەوە، بەلای کەمی لەڕووی پرەنسیپەوە، بەو پێیەی نمونەیەکی بێوێنەیە - وا لەقەڵەمدرا گوایە بایەتیانە بەشێوەیەکی ڕاستەقینە و دەشبێ ئەو هەڵەیە بەلاوەبنێ، کە خوێنگەرمانە دەستنیشان و وەسپیانکرد- هەرچەندە ئەو هەڵوێستە ڕزگاکەرە جێگرەوەیەش تەمومژاوی بێت و ئەستەم بێت لەڕووی دیاریکردندا، هەرەمەکییانە تیا ڕۆچووبێ، لەوەشەوە دووچاری گەمە پێکردنێکی بە ئەنقەست ببێ، لەڕووی پرەنسیپەوە بڕیاریان لەسەر دا، سەرباری ئیمانیان بەخاوەنبویان .

پێشەنگانی پۆست مۆدێرنیزم هەنگاوێکی دیکە پێشکەوتن، هەروەکو فرانکفۆرتییەکان، نکۆڵیان کرد لەپەیوەست بوون بەڕاستیە لابەلاییەکان و شەنوکەو کردنیان .

ئەو ڕاستیانەی بەهەڵە تەبای ڕێگەی درککردنی واقیعی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دران، بەڵام ئەوان جارێکی دی بەڕێگەیەکی جێگیرەوە (سنوردار بەشێوەیەکی پەنهان) یان گۆڕیەوە، بەڵکە بەمسۆگەری گوایە ئەوجۆرە ڕێگەیە ناشێ یان پێوست و ویستراو (پەسەندکراو)نییە، ئۆبژێکتیڤیستی ڕواڵەتیانە نییە، کەنکۆڵی دەکات و ناچێتە ژێربار،



بەڵکە خۆی لەخۆیدا ئۆبژێکتیڤیستە. بەتەنیاش بڵاوکردنەوەی ئۆبژێکتیڤیستی هەڵە و قەڵپ (دەهەمبەرئۆبژێکتیڤیستی ڕاست و حەقیقی) نەخرایە پاڵ ئەستۆی نەیارە ستەمدیدەکان، بەڵکە تەسلیم بەوەبوون، کە ئەوان خودی خۆیان هەڵەن و تاوانیان لەڕووی سیاسی و ئیدراکی و مەعریفیەوە هەیە، بەهۆی کۆششکردنیان بەدوای خواستی ئۆبژێکتیڤیست لە ڕەهاگەرییەکەیدا. ئەو وتارەی ر.ڤاردۆن، کە پێشتر شایەتیمان پێدا ئاماژە دەدات، بەوەی ئەوان خۆیان وا لە قەڵەم دەدەن، کە ڕاستەوخۆ لە رەحمی کاکڵەی بەرەی بزوتنەوەی بونیاتگەرایی کەوتونەتەوە و گەرچیش ئەوانن رموزەکانی دەترازێنن و ڕووتدەکەنەوە، ئەوانەی بەڕۆشنبیریش سەرقاڵ بوون، بەڵام وایان زەندەکرد دەتوانن ڕۆشنبیریی بۆ پێکهێنەرە دوالیزمیەکەی، هەڵیوەشێنێتەوە، بەسەر هێڵەکانی میتۆدێکی شیکردنەوەیی ئەوتۆ وەك پێدەچێ باش بێ لەبواری دەنگسازیی زێدە سادەدا. دەبێ حەقیقەتی بابەتی بە حەقیقەتی تەئویلی بگۆڕدرێتەوە، حەقیقەتی تەئویلی ڕێزدەنێ لە هەردوو سەبگێکتیڤیزمی بابەتی لێکۆڵینەوە و لێکۆڵراو بەیەکەوە، بەڵکە تەنانەت خوێنەر یا بیسەریش، لەواقیعیشدا پەیرەوکارانی میتۆدەکە بەشێوەیەکی قووڵ و خوێنگەرمانە فرچکدران لەرووی توانایی واتا و ئارەزووی ترازانی واتا پەیوەستدارەکان بەبابەتەکانیان و خودی خۆیان و خوێنەریان و هەر کێ کە بەجۆرێك هەریەك لە ئێمە لەکۆتاییدا مەیلی وەرگرتنی قەسیدە و مەوعیزەی ئەخلاقی دەکات لەبارەی بازنە داخراوەکانی واتادا، کە هەموو کەسێ لە پێوەندەکەی زیندانی دەکات و بەیەکەوە لەیەککاتدا دووچاری حاڵەتێکی ئازارکێشی بە لە ززەتی دەکات .

برتراند راسل جارێك باسی لە "تەنگوچەڵەمەی سێنترالیزەکردنە سەر خود" کرد، چوون گرفتەکە لەتیۆری مەعریفەوە سەرچاوە دەگرێ، بەو پێیەی خودی تاکە کەسی پەلبەستکراوە لە کۆتبەندی بازنەیەکی داخراو لە هەست و نەستی هەنوکەییەکانی تایبەت بەخۆی و چ ڕێگەیەکیش لەبەردەمدانیە بۆ گەیشتن بە مەعریفەی حەشاردراوی ئەو دیوی، دەرهاویشتە کردەییەکانیشمان چ شتێ ناخەنە ڕوو نەلەبارەی ڕابردووەوە و نەلەبارەی ئێستاو نەلەبارەی ئامانجە هەمیشەییەکان و نەلەبارەی ڕژێمی ملکەچ بۆ

فرمانی یاساو نەلەبارەی خەڵکانی دیکەش، ئەو بەتەنیا خودی خۆیمان دەداتێ. ئەزمونگەرێتی لیبڕاوانەش کە نکۆڵی لەهەر پازدانێك دەکات بەرەو ئەوەی بەتەماشاکردن مایەی سەرنج نییە — سەرنجدارنییە - بوارمان نادا پتر پێشکەوین - هەنگاوبنێین -. بانگەشەکەرانی پۆست مۆدێرنیزم دانەکی دیکەی جیای تەگوچەڵەمەی سێنترالیزەکردنە سەر خود -یان دۆزییەوە - پاش گەشگەبوون بەدۆزینەوەی ئیدی بەهەرحاڵ قۆستیانەوە، بەجۆرێك تاك لەبازنەکەدا گیردەخوات، بەلاّم بازنەی هەست و نەستە ڕاستەوخۆکانی نییە، بەڵکە واتا دەلالەتیەکانیەتی، لەبەرئەوە قەلاّی یەقینی بەڵگەدار، کە ئەزمونگەر - تەجریبی - لە مەتەرێزی خود و لە هوشیارییە ڕاستەوخۆییەکەی دەپارێزێ، دووچاری ڕمان و لێکترازان دەبێت — تەنانەت ئەو درکپێکراوە ناوەکیانەش بارگاویکراو و فرچکدراون بەواتا، ئەو واتایانەش بەدەوری خۆیان کۆتکراون بە کۆتمەرجی ڕۆشنبیری و دژ و"هەڵوەشاندنەوە"ی گەرەکە، ئینجا پۆست مۆدێرنیزم هەوڵدەدات ئازار و خەم وخەفەتی ئەزموونە مەیدانییەکەی بەیەکەوە گرێ بدات، کە خۆی و بابەتەکانی تیا شلوشەکەت بوون بۆ ئازادبوون لە دیلیەتی ئەو دوو دورگەیەی باڵبەستیان کردووە و گەیشتن بەکەنارەکانی یەکتری .

هەڵبەت پێویستە شکست بێنن! کاتێکیش ئەو شکست ناهێنێ و سەردەکەوێ لە گەڕانەوە بۆ وەسپکاریی ڕوون و بەدیقەت و لیبڕاوانە لەوەی بەڕاستی دانیشتوانە خۆماڵیەکان مەبەستیانە، ئەوە ئەمە بەپێی راوبۆچوونەکانی پەیرەوکارانی نوێخوازییە لەمەوپاشیەکەمان هەرە زێدە شێوەکانی شەرمەزاری و ناپاکی تۆقێنەرانە دەنوێنێ.

ئەمەیە کە دوا ناپاکی و شکستی ڕاستەقینە فۆرمەڵەدەکات، ئەوەیە ئەوەی بەڕووەتێکی پۆزەتیڤیستی ڕواڵەتیانەی بەدیاردەخات، کە کاردەکات لەخزمەتی کۆلۆنیالیزم و نایەکسانی نێوان فەرهەنگەکانی دابێت بەهۆی بانگەشەی سڕکردنی - تەجمید - ئەویدی و گەمارۆدانی بەزمانی مانا تایبەتیەکانی و پاشانیش هاندان و خەڵەتاندن و سپلاّندنی ئەوەی دیکە و بەدیار خستنی خودی بێبەش لە هەست و نەستکردن بە تایبەتمەندێتی تاهەتایی تێکڕای ماناکان و سەختی بێسنوری هاوشێوە،



کە ئەستەمە، بەهۆی ئەو کەلێنە دابڕە تۆقێنەرەی نێوان جیهانگەلی واتای دەلالەتی بەیەکتری ڕابگەیەنرێ و بگەیەنرێ.

هەڵبەت لەوێدا بەلای کەمی دووکەلەن هەن، یەکێکیان لێکۆڵەری پۆست مۆدێرنیزمانە لە -موخبیر - جیادەکاتەوە و ئەویدیکەش نووسەر و خوێنەرانی لەیەك دووردەکاتەوە جا لەڕووبەڕووبونەوەی هەریەك لەو دوو کەلێنەش هزرڤانانی پۆست مۆدێرنیزم کاتێ ژیریی و هەستەوەرییە پۆست پۆزەتیڤیزم بڕەکەی، دەسەلمێنێ لەمیانی ڕۆچونی لە هەر یەکێکیاندا و بەدەرخستنی قۆلاّییە ڕاستەقینەکەی و درککردنی گرفتە تەئویلیەکە و لەمیانی نوشوستی ئاشکرایی لەڕەتدانی هەرکامیان، بۆ پەڕاگەندەبوونی بۆ شپرزەیەکی هیولانییانە و شێوازی پەخشانئامێزی گاڵەدراوی ئەوتۆی تێنەگەیشتراو و چەنەبازییەکی قسەییانەی هەڵەوەرانە. گەریش نیازمان دیقەتێکی تیژوتوندانە بێ، ئەوە لەسەر ئەوانیدیکەیە بێدەنگ بن (لۆجیکیانە)، بەلاّم پۆست مۆدێرنیزمەکان بە ڕاستی ڕاوبۆچونیان بلاّو دەکەنەوە و هەندێ جاریش تا ئاستێکی زێدەڕۆییانەی لە ڕادەبەدەر، نەشیان توانی بەتەواوەتی قەناعەت بەخۆیان بێنن بەپەسەندکردنی ئەو ئەنجامە سروشتییە لۆجیکیانەی قووڵیەتیان، بەلاّم ڕەنگە بەهەق هەندێ هزرڤانی نوێخوازی لەمەو دوایی چاك هەبن، ئەوانەی ببڕای ببڕای شتێك بلاّوناکەنەوە و بەپێی گریمانەی پێشوو هزرڤانی پۆست مۆدێرنیزمی چاك ئەوەیە، کە بێدەنگ بێت. ڕەنگە یەکێ لەو شێوازە ڕاستەقینە و بلیمەتیانەی نوێخوازی لەمەودوایی ڕۆژێ لەڕۆژان تەکانمان پێبدا بۆسەرسامبوون بەو بێدەنگییە بێهاوتاقووڵە، هەروەك چۆن تارادەیەك یەکێ لەنیگارکێشە پێشەنگەکان دەیکات، کاتێ سەرسامبوون بە تابلۆیەك وەدەست دێنێ، کە بەسانایی هەڵساوە بەڕووکەش کردنی بەبۆیەیەکی ڕەشی هاوشێوە.

کەواتە، ڕێرەوی ئەو ڕێگەیەی دەمانبات بەڕێوە هەر لە بەدوورخستنەوەی بەرهەڵستکاران لەلایەن مارکسیەتەوە لەپێناو ئۆبژێکتیڤێستی هەڵبەستراوی قەلپ، ئینجا ڕەخنەگرتن لەفێرگەی فرانکفۆرتی پۆزەتیڤیزمانەی ڕواڵەتیانەی هاوشێوە بۆ کۆکردنەوەی ڕاستیەکانی سەر ڕووکار تادەگاتە نکۆڵیکردنی نوێخوازی لەمەودوایی -

البعدیه -ی بەمەبەستی بابەتیانەیی لەخۆیدا و گۆڕینی بەتەئویلیەت، ئەو ڕەوتە ئەو هێڵەیە کە ڕایگرتووم، وێڕای ئەوەی داخوا پەیوەستە بەبۆچوونی زاتی بەشداربووان لەبارەی پێشینە فیکریەکانیان یا بەپێوەندە مێژووییە کردەییەکان، چونکە ئەمە کارێکە هەر ئاواهی پێویستی بەدۆزینەوە و پتەوکردنە.

هەروەها لێرەدا بەجۆرێ ڕێگەیەکی ئەلتەرناتیڤ و سەرنج ڕاکێش هەیە، جڵەوگری بەرایی ئەو سەرکەوتنە هەڵبەستراوەیە بەسەر تیۆری مەعریفە، بەسەر "ئەپستمۆلۆژیا"، سەرکەوتنێك کەوا ستایش کرا، بەو پێیەی دەسکەوتێکی مەزنە بۆ فەلسەفەی سەدەی بیستەم. کە ئەوە بەناوی وەکو فنگشتاین و هایدگەر و رورتی و هیدیکە [٣٥] دەبەسترێتەوە، جا بەقەد ئەوەی ئەپستمۆلۆژیا بۆ بەدواداچوون و کۆڵینەوە لەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی ئەقڵ دەبنەوە لەکۆششیدا بەدوای خواستی مەعریفەیەکی ڕاستەقینەی دەرەکی دادەنرێت، ئەوە مرۆ مەزندەی هەستکردن بەو ئاستەنگانە دەکات لەلایەن بزووتنەوەیەك تا ئەو ڕادەیە بارگاوی کراوە و فرچك دراوە، چوون لەواقیعدا گۆڕیویەتی بۆ جۆرێك لە تایبەتمەندێتی خانەوادەیی، کە ختوکەی خود دەدات، ئاوا مامڵەی ئەپستمۆلۆژیای بکات وەکو هاوپەیمانێکی ڕێزدار، بەڵام کار بەردەوام هەر ئاوها نییە.

خاڵی سەرەکی خۆی لەمەدا دەنوێنێ: کولتوری مەزنی ئەپستمۆلۆژیا لە فەلسەفەی خۆرئاوادا(گوایە ئێستا شکستی خواردووە)، کە لەدیکارتەوە بۆ هیۆم و کانت و ئەوانەی دوابەدوایان هاتن، هەڵکشا، گرفتی مەعریفەی بەزمانێکی تەئویلی هاویەکسانانەی تەئویلی دانەڕژتووە، بەلکە بەزمانێکی دەستەبژێرانە لە ڕووی درکپێکردنێکی جیاکەرەوانە، ئەویش بەڕاستی بڕوای هەیە بە یەکسانی تێکڕای مرۆ و ئەقڵەکان، بەڵام بە لای ئەو هەموو ڕۆشنبیریەك و تێکڕای سیستەمەکانی واتا، یەکسان نیە، تێکڕای ئەقڵەکان ئیمتیازاتی پەنهانی ئەوتۆیان پێ بەخشراوە بۆ بەدەستهێنانی هەقیقەتی بێهاوتای بابەتیانە، بەڵام تەنیا بە مەرجی بەکارخستنی میتۆدێکی ڕاست و نکۆڵیکردن لە فریودانی بەگەڵدانی ڕۆشنبیریی بۆسەر بنەماکانی



مەعریفە، ڕۆشنبیریی (ئەوەی دیکارت بە "داب و نەریت و میسال)ناوی بردوە لەمیتۆدی دیکارتی چاوگەکە(المصدر) بە (ئەلفولامی تەعریف) هەڵەکەی لەئەستۆدا بوو، ئەمەش هەڵبەت بەکارێکی دزێووکریت لەقەڵەم دەدرێ سەبارەت بەوانەی بە ڕۆحی نوێخوازی پۆستێرن -لەمەودوایی — فرچك دراون، ئەوەیشی کە دیکارت وشوێنکەوتەکانی وتیان لەواقیعدا ئەوەیە لێرەدا بڕێکی تۆقێنەری واتا و ڕاوبۆچوون هەیە لەبارەی مەحەکی پێوانەیی-نۆرماتیڤ-، کە مەڕ لەبزنەگەل جیادەکاتەوە، ناکرێ هەر هەمووی ڕاست بێت، واچاکترە بۆ ئێمەش بیدینینەوە و بیگونجێنین و لێهاتوییەکەیشی بسەلمێنین. سەبارەت بەدیکارت، مەحەکی پێوانەیی بریتیە لە بەکارخستنێکی(حەسری)  واتا ڕوون و جیاکان، ڕوون و جیا تاپلەیەك بەسەر هەموو ئەو ئەقڵانە دەستڕۆیشتوو بێت، کە هێندەی لەڕەسەنایەتی و مکوڕایەتی لا هەبێ تا هزردار بێ، وێڕای ئینتیما ڕۆشنبیریەکەی، ڕێگەی گەیەنەر بەهەقیقەت لەمەنفای ئارەزوومەندانەی ڕووناکبیرییەوە دەکشێ و چوار چێوەی دەسەڵاتی تیۆری مەعریفەی مەرکەزی کلاسیکیزم ئەو گریمانەیەی گرتبوە خۆ، کە لێرەدا ڕێگەیەکی ڕاست و یەکێکی هەڵە هەیە بۆ ئەدای ئەرکوکاری بەدەست خستنی مەعریفەت: گرفتەکە لەوە خۆی دەنوێنێ، لەدۆزینەوەی جیاوازی دیارو بەرچاوی نێوان هەردوو ڕێگە و پاکانە بۆ کردن و گونجاندنی لەکاتی دیاریکردن و دەسنیشانکردنی جێگەورێگەو پێگەکەی. بەڵام بیرۆکەی هاوچەرخ ئاماژە دەدات بە نەبوونی ئەو جۆرە جیاکارییە و جەخت دەکاتە سەر ئەوەی چێکردنی سیستەمێکی پۆلینکارانە بۆ جۆرەکانی مەعریفەت بەکارێکی بەدو ئازاربەخش دادەنرێ لەسەر هەردوو ئاستی ئەخلاقی و سیاسی، هەروەکو دانانی توێژاڵی بۆیە لەسەر ئەویدیکە (لەگەڵ هێمایێ، کە ڕادەی ئاماژەکردن دەترازێنێ، وەلێ ڕەنگە هەردوو ڕێگە جیاکە بەیەکتری ببەسترێنەوە).

ئەو ڕێگەیەی وەرچەرخانە تازەکەی فەلسەفە، واتە: سەرکەوتنی هەڵبەستراو بەسەر ئەپستمۆلۆژیای کۆنی سەرقاڵ بۆ کۆشان بەدوای مەبەستی هەقیقەتی بێهاوتا بەبزووتنەوەی نوێخوازی پۆستێرن دەگەیەنێ، بەدیتنێکی چاوتیژانە و بەشتێکیش

لەگاڵتە خرایە ڕوو، ئەمەش لەلای ئەندامێكی بزووتنەوەكە بوو بەناوی بۆل رابینۆ، كاتێكیش كاروكردەوەكەی ریچارد روتی، كە یەكێ بوو لەو هزرڤانانەی پشكداریان كرد لەدارِژتن و ڕوونكردنەوەی ئەو دیتنەتازەیە، تاوتۆكرا، رابیتۆ لەو كتێبەی هەریەك لە كلیفۆرد و ماكۆس ئامادەیان كرد دەڵێ: هەروەكو جۆرێكی نزیك لەوەی "مانیفێستی" بزوتنەوەكەی هاتە ئاراوە، هێشتاش شایەتی پێدەدەین [٣٦].

(هەوڵ وكۆششی ئەو هزرڤانانە بۆ بونیاتنانی ئەلتەرناتیڤێ یا دارِشتنی تیۆرگەل چاكتر بوو لەوەی پەیوەستە بەفیكر و مەعریفەت و ئامانجیان چاككردنی ئەپستمۆلۆژیا نەبوو، بەڵام یارییەكی جیاوازی ئەدا كرد، رورتی ئەو یارییە بەزانستی تەئویل ناودەبا، ئەمەش بەسانایی واتە مەعریفە بەبێ بنەمایەكی ڕێسا ئامێز، مەعریفەیەك لەناوەرِۆكەوە ئاوازی گفتوگۆكاری ڕووناكبیرانەیە، تاكو ئێستاش رورتی زۆركەمی پێ وتوین لەبارەی كرۆكی ئەو گفتوگۆكارییە، ڕەنگە لەبەرئەوە بێ هەرهێندە زۆركەمەی لابێ تا پێمان بڵێ).

روونە رابیتۆ لەگەڵ هەڵوێستی بنەڕەتی رورتی كۆكە، بەڵام هەروەكو چۆن ئەو (لەمسەگاڵتەجارِیە ) شیاوە، گوزارشی لێكرد، ئەو لەو بڕوایەدا نییە رورتی بەپێی پێویست تارادەیەك بۆی چووبێ، بەهەرحاڵ دووریش نییە رورتی بەپێی رابیتۆ لەتیۆری دێرینی مەعریفە پێشەڤەچووبێ، كە رۆڵی تاقیكەرەوەی توندوتیژی گێراوە، كە لەكۆتایی كۆرسی خوێندن قوتابیان تاقیدەكاتەوە، زۆربەی دەرناچوێنێ و هەندێكیان سەركەوتوو دەكات، كەمێكی زۆركەم نەبێ بەنایاب و هەرەباش پاداشت دەكات، ئینجا رووە و ئاخێوەرێكی زێدە دڵنەرم و لێبوردە، بەئاخاوتن لەگەڵ هەموان دڵشادە و لەرووی جیاوازی لەگەڵ یا تۆمەتباركردنی یەكێك بەهەمان شێوە. رابیتۆ لەو بڕوایەدایە دیتنە چاودێریەكەی رورتی بەهۆی فۆكۆوە گەشەدەكا و بەئاكام دەگات و لەژێر تیشكی ئەو چاككاریانەدا بۆدارِژتنی میتۆدی تازەی ئەنترۆپۆلۆجیا پێشدەكەوێ[٣٧].

(پێویستە ئەپستمۆلۆژیا وەكو ڕووداوێكی مێژوویی بدینین.. یەكێ لەو چەند ڕووداوانەی بەڕوونی لەئۆروپای سەدەی حەڤدەهەم قووت بویەوە... ئێمە پێویستیمان...



بە ئەپستمۆلۆژیایەكی تازەنییە، لەسەرمانە هوشیاری هەڵسوكەوتە مێژووییەكانمان بین، كە كاری كرد بۆ كەواندنی هەڵسوكەوتە ڕۆشنبیریەكەمان بەسەر ئەویدیكە، لەسەرمانە سیفەتی ئەنترۆپۆلۆجیا بەسەر خۆرئاوادا دابڕین، دەرخستنی ئەو ڕادەسەیر و سەمەرەیەی ستراكتۆری واقیعی ڕاستەقینە لەسەری بوو... دژە هەنگاوی بنەڕەتی زاڵیەتی ئابوری یا فەلسەفی لەفرە جۆرایەتی سێنتەرەكانی بەرگری خۆدەنوێنێ: خۆپارێزی هەڵەی كرۆكسازیی پێچەوانە: خۆرئاواناسی چارەسەری خۆرهەڵاتناسی نییە).

دوا سەرنج هەڵبەتە نیشانەیەكە ئاماژە دەدات بەو تۆمەتباركردنەی، كە دەڵێ هزرڤانە خۆرئاواییەكان وێنەیەكی زیهنیان بۆ خۆرهەڵات خوڵقاند بە فۆرمێكی قەڵپ، ساختە - دادەنرێت و بەفرتو فێڵێكی سەپێنراوی خەڵەتێنەر و ئامرازێك ئامێر ئاسا بۆ ملكەچكردن و زاڵیەتی بەیەكەوە لەیەككاتدا، ناشێش هەمان شتیش لەگەڵ خۆرئاوا بكرێ، هەروەك رابیتۆ دەڵێ، ئەوە گونجاونییە: ئەنجامدانی ئەمە واتە دروست كردنی خۆرئاوایەكی یەكگرتوو و ڕێژەگەرایی فرەییش دەبێ بەسەر خۆرئاواشدا پیادە بكرێت یا بەسەر تەئویلكردنەكەی، بەهەمان ئەندازەی كەلەسەر ئەوەی نێوانی و نێوانی خۆرهەڵات(یاولاتانی خۆرهەڵات) پیادە دەبێت...، بەڵام بەڕاستی بڕگەكە ڕوونی دەكاتەوە كەوا بریتیە لەو هاوبەندییەگەیەنەرەی نێوان نكۆڵیكردن لە تیۆری مەعریفە لەلایەك و ڕێژەگەرایی نوێ لەلایەكی دیكەوە، ئەپستمۆلۆژیا حوكمێكی بەسەر چەندەها جۆری جیاجیای مەعریفە دەرچوواند، ئەمەش ببڕای ببڕ شیاووگونجاو نییە.

## ڕێژەگەرایی لەپێش هەموو شتێکەوەیە

ئایا ئەوەی بەهەنگاونان بەرەو ئەو پەڕ لەو ئاڕاستەیە، وەسف دەکرێ، بوونی هەیە؟ ئەو کارەی ئیشی لەسەردەکەین، رابیتۆ بەهەمان ئاقار بەردەوام دەبێ لەوەسپکردنی ئەو مەودایەی ڕەنگە ئەو شێوازە پێی بگات و جارێکی دیکەش بەبێ ونبوونی ئیدراك و گیانی گاڵتەجاڕیی، وێڕای ئەوەی من لام زۆر ڕوون نییە داخوا بە شێوازی پەلەکردن یا نکۆڵی لێکردن (ڕەنگە هەردووك جیاوازنەبن) وەسپی دەکات.

بەڵگەمان بە هەندێ بڕگەی ئەو کتێبانەی هێنایەوە، کە پەیوەستن بەو ئاڕاستەیەی، دەبێت شێوازی ئیتنۆگرافی پێڕەوی بکات. رابیتۆ قسە لەسەر کاری جیمس کلیفورد (یەکێکە لەو ئامادەکارانەی ئەو کتێبەی کە خودی هەمان وتاری تیا بوو) دەکات، بەر لەهەر شتێك سەرنجدەدا کە لێرەدا جیاوازییەکی گرنگ هەیە لە نێوان کاری جیمس کلیفورد و ئەوەی کلیفورد گیرتز نووسی، چون یەکەم سات وا مەزەندە دەکات ئەمە بەردەوامییە لەسەر هەمان ئاقار: گیرتز، یا گشت خولیا تەئویلییەکانی یا تەفسیرییەکانی هێشتاکە "کلیفورد" هەوڵ وکۆششی دەبات بەرێوە بۆ دووبارە داهێنانی زانستی ئەنترۆپۆلۆژی، بەڵام کلیفورد هەموو ئەمانەی بەقۆناغ ترازاند و چیدیکە بایەخی نەدەدا بە "ئەویدیکە" (واتە بابەتی ئەتنۆگرافی، کۆمەڵگاکان و ڕۆشنبیرییەکانی دیکە): "ئەویدیکە"بەلای کلیفورد نواندنێکی ئەنترۆپۆلۆجی ئەویدیکەیە. رابیتۆ هەڵوەشاندنەوەی کلیفوردی بۆ هەڵوەشانەوەی ئەنترۆپۆلۆجییەکان بۆ...، تد، هەڵوەشاندنەوە، ئایا ئەمانە لەکوێ بەکۆتا دێن؟ .

کلیفورد چ بایەخێکی ئەوتۆی بەگەلانی سەرەتایی نەداوە، ئەو بایەخدارە بەوەی ئەنترۆپۆلۆجییەکان پێی دەڵێن... چی بەو مرۆیە دەڵێی تەنیا بایەخدارە بەوەی کلیفۆرد دەیلێ لەبارەی ئەوەی ئەوانیدیکە دەیلێن...؟ ئەمە ڕەنگە وەکو حدسێکی کیبرکێیانە لەقەڵەم بدرێ، لەگەڵ مەیلێك لەگومان، لەهێمایەکی ئاماژەدارانە بۆ



جۆرێك لەبەڵگەی ناڕاستەوخۆ... هیچ شتێك لەم ڕووەوە بڕای بڕ بوونی نییە، بەڕاستی کارەکە دوایی روویدا ر ابیتۆ هەڵسا بەجاڕدان و دووبارە داڕژتنەوەی ئەو هەنگاوە زێدەیە لە هەڵگەڕانەوە پاشەکشەکارییەکەدا و وایدادەنێم ئەو پەسەندی کردووە و تەنانەت ئەو بانگەشەکەرەلەرادەبەدەرانەی پۆست مۆدێرنیزمیش، پیاو یا ژن، وەك سەبگێکتیڤیزمی خۆی بەپێی پێویست ڕەچاوناکات. چوون هوشیارییە ئیدراکییەکەی بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە خودی هوشیارییەکەیدایە ،کەتەنیا بەسەر ئەوەی نێوان ڕۆشنبیریی (تەرزە کۆن) و (هەروەها) خەڵکی دانەبڕاوە، بەڵکە بەسەر ئەوەی نێوان ساتەکان و حاڵەتە مگێزییە بەردەوام و یەك لە دواییەکەکانیش دایە[٣٨].

(هزرڤانی پۆست مۆدێرنیزم لەو تاریکستانە گرمۆڵەیە بەر رەوش و پێگەکەی گرتووە، چونکە ئەو بەو پێیەی پۆست مۆدێرنیزمە، تاکو ئەو پەڕی پابەندە بە ئەقیدەی هۆگریی و بێباری، کە لە پێناویدا تەنانەت شتەکانیش هەروەکو خودی حاڵەتەکەی وانە، ناجێگیرە، بەبێ شوناسە، ناکرێ بەبابەتگەل و ئامانجی بیرکردنەوەی بەردەوام و درێژخایەن لەقەڵەم بدرێت).

لەبەرئەوە بۆ ساتێ وادامەنێ تۆ لەمیانی ڕەتکردنەوەی خستنە سەری سیفەتی ڕەهایی بۆسەر حاڵەتە مگێزییە بەسەر چووەکەت و پەڕاگەندەیی تەبای بێباری، دەتوانین لەدەست دووچاربوون بە هەڵوەشانەوە و ئاشکرابوون وتەکاندانی کەوتن، هەڵنوتانێکی ئازاد لەنێو بۆشاییدا (ڤالایی)، چ بە ناوچارەسەرێك لەوێدا نییە، ڕەخنەگرانی ڕێژەگەرایی تەنانەت تاوەکو ئەو پەناگەیەش هەڵتدەبڕن، گەر هاتوو ئەو خواستنەوە خوازەییە دروستەی دڵنەواکار ڕێگەی پێداین. ئاساییانەش هەڵبڕیش، هەڵبڕاوە و ئیدی ئا بەم شێوەیە. لەڕاستیدا واچاکترە دەستمان لەو هەمووە داتەکێنین و بڵێین ئەوەی مایەوە، بێدەنگییە.

لە نێو تێکڕای ئەو کولتورەش، دەکرێ لابەلا دووبیانووی ڕوون جیابکەینەوە، کە گەرچیش لەرووی ریزبەندیەوە نارێکن، وەلێ هەردووکیان سیفەتی تێهەڵکێشییان هەیە .

یەکێکیان ئاماژە بەوە دەدات، کە هەوڵ وکۆشش بەدوای ئۆبژێکتیڤیستی لەواقیعدا خواستێکی، ئامانجێکی قەڵپە، شێوەیەك لەشێوەکانی زاڵیەتی بەرجەستە دەکات: چاودێرەکە بابەتەکە دادەبڕێ و حوکمدانە سەری دوادەخات (شێوازەکە بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش هاوجووتە دەگەڵ ئەو شێوازە تایبەتییەی لویچی بیراندیللو دایهێنا بەکارنەکردن بەهۆی دابڕینییێکی باوی تەقلیدیانە لەنێوان دانەر و ئەکتەر و کەسایەتی و ئامادەبووان)، بەڵام لەوێدا ئەو پەڵپ و بیانوگەرێتیەش هەیە، کەدەڵێ جیهان زێدە ئاڵۆزبووە، ئەو جیاکردنەوەی نێوان ڕۆڵە کانیش چیدی ناکرێ (بەڵام لەمەو پێش کارێکی کردەنی بوو) بەڕای من، ڕاستە جیهان زێدە ئاڵۆز و شێواوبووە و کەمتر هاوسەنگ و سەقامگیر، بەڵام ئەمە تەنیا ئەوە بەدیاردەخات هەقیقەتی ئەوەی ئۆبژێکتیڤیست زێدە واقیعییە و ناشکرێ نکۆڵی لێ بکرێ، ئەمەش هەرگیز بەومانایە نییە، کەلێڵ و وێڵە بەشێوەیەکی بنجداکوتاو و پێویستە بگۆڕدرێ بەوئاشوبە شێواوو بەرهەڵستکارییە شێوازییانە، گەریش سەرنجماندا جیهان گۆڕاوە، ئەوە لەبەرئەوەیە چونکە وەك پێدەچێ وێڕای هەموو شتێك هەندێ زانیاری بابەتیانەمان لەبارەی لا هەیە.

هەڵگەڕانەوە پاشەکشەیەکەیان کەڕووەو سەبگێکتیڤیزم و ڕوانین لەخودە، شیاندنە لۆجیکیانەکەی هەر چیەك بێ، ئەویش لەجیاتی شێوازێکی ئەکادیمی لێهاتووانەی پەخشان ئامێز وەسپ دەکرێت [٣٩].

(دوابەدوای ڕامان لەقەیرانی نواندنکارییەکان... واتای وەرچەخانە... بەرەو... بەتەنگەوەچوونی دوابەدوای نەریتە کولتورییەکانی نواندنکارییە لەمەودواییەکان...).

ئەو چەنەبازییە وڕێنەکەرەش بێکۆتاییە. بەڵام لەوێ هێمای ئاماژەدەر هەیە بە بیرۆکەیەکی بنەڕەتی و یەکدیگیر بەجۆرێ لەهەموو ئەمانەدا: دەستپێك لەو خاڵەی یاریدەدەری وروژاندن و هاندانی ئەپستمۆلۆژیایە، بەمانای لەوێ ئامراز هەن بۆ مەعریفە بەکاردەخرێن، و مایە و شایستەی کۆڵینەوە و بەدواداچوونن (لەهەمانکاتدا، کە تیایا خواست و مەبەستی ئەپستمۆلۆژیا نکۆڵی لێدەکرێ بۆ



دۆزینەوەی ڕاستی لەچەوتی) لەوێ هەوڵدانێ هەیە بۆ گرێدانی ئەمە بەڕاستیەوە، ڕاستیەك گفتوگۆ قبوڵ ناکات و گوتویەتی لەو جیهانەدا گەلەك حاڵەتی نایەکسانی لە هێزداهەن (و شێوازی دیکەی نایەکسانی، بەقەد ئەوەی کارەکە پەیوەستە پێی) ئایا هاوبەندییەك هەیە لەنێوان ئەو ڕێگەیەی ئامرازەکانی مەعریفە بەهۆیەوە ئەو جیهانە دروست دەکات، کەنیازی دۆزینەوەی هەیە و لەنێوان ئەو حاڵەتانەی نایەکسانی بەر پرسیارێکی ڕێك و شیاوە.

لەبەدبەختیا، ئەندامانی ئەو بزوتنەوەیە زۆر بەپەلەن بۆ پوختەکاریی دەرەنجامەکان، لەگەڵ مەیلی وەڵامدانەوە بەبەڵێ یەکی سانا و ڕواڵەتییانە (چونکە دیاریکردنی وەڵام واتە دانپیانان بەوەی وەڵامدەر کۆنە پەرستە) ئینجا لە هەوڵدانێکی ناتەبابییانە بۆ بەدەستهاتنی ڕێگەی دەرچوون لەتەنگوچەڵەمەی ڕێژەیی، یەکبەدواییەك پەلبەست دەبن لەتەڵەی هەڵگەڕانەوەی پاشەکشەییانە، کە ڕێگە بەهیچ شتێ نادرێ تیا بوەستێ، یا هەموو شتێ تیایە چونیەك بەیەکسانی دەوەستێ و دەرکەوێ، بەڵام ئەوان تاڕاددەیەك حەزیان بەو تەنگانەیەیە، ئەمەیە تایبەتمەندێتیان و جیاییان و بالایی خۆبەزلزانی بەسەر پۆزەتیڤیزمانی نەزانی بەستەزمان. ئایا تۆم لیهرر ئەوبوو کە لەیەکێ لەمەنەلۆژە شەنگەکانی توانجی گرت لە ئافرەتێکی ئەمریکی، کە بەبێ وەستان چەنە بازی دەکات لەبارەی ئەو مەودایەی مەحاڵبوون، کە دەیبینێ بۆ ئەوەی بەردەوام بێ (فرمان بەردەوامیە لەئینگلیزیدا — to communicate - بۆتە فرمانێکی تێنەپەڕ، کەبەمەواتایەکی گرنگی دەبێ)، بەڵام پەیوەندییە سیاسییەکانی بیروباوەڕی بزوتنەوەکە، هەروەك خودی ئەندامانی لێی تێگەیشتوون، بەچاکترین شێوە گوزارشتیان لێکراوە لە بەشداریکردنێك لەلایەن یەکێ لەئامادەکارانی کتێبەکە، جۆرج.ی.مارکۆس، لەوتارێکی بەناوی "ئەتنۆگرافیا لەسیستەمی جیهانی نوێدا"، دەخوێنینەوە.

(ئەو بزاوتە ئاراستەیەی ئەتنۆگرافی لەئابوریی سیاسی ئەکادیمی لەئەمریکادا... پێوەندە بەو داڕمانە ناسراوە لەسەر ئاستێکی فراوانی سیستەمی

نێودەوڵەتی،کە ئەمریکا پێگەیەکی زاڵیانەی تیا داگیرکرد... و هەستکردن بەوەرچەرخانێکی قووڵ لەو ڕێسا دامەزرێنەرانەی واقیعی خۆماڵی و نێودەوڵەتی، هەروەکو لەڕوانگەیەکی ئەمریکییەوە دەبینرێ، بەدەوری خۆی لەڕووی فیکرییەوە بەشێوەی پاشگەزبونەوەیەکی گشتگیرانە ڕەنگی دایەوە لە کایەکانی مەعریفەی سێنترالیزەکراو و ڕێکخراولەڕووی تیۆرییەوە و ئامانجەکانی هەڵسوکەوتی ڕووناکبیرانەی زانیار و ڕێکخراوی لەبوارە فرەجۆرەکانی وەکو: مێژوو، زانستە کۆمەڵایەتیەکان و ئەدەب و هونەر و تەلار، پێگەکانیان جێهێشت تاوەکو پەرتایەتی و ئەزمونییەتی داگیربکەن، کە مەبەستیان دۆزینەوەکاریی بووە... و نواندن و فرەجۆری بوو... و لەو ئامرازە کرچوکاڵانەی تەجریب، پەیوەندە بەو خولیایە، ئیتنۆگرافیا لە نێو ئەنترۆپۆلۆجیا دێت).

ئەمە بەرێگەیەك گوزارشت لەهەموو شتێ دەکات وەکی دیکە، دەڵێین: کەمێ دوای شەڕ، ئەمریکا بەسەرجیهان زاڵبوو، بەڕای خۆیان تێکۆشان لە پێناوی سیستەمدا (کایەکانی مەعریفەی سێنترالیزەکراو و ڕێکخراو لەڕووی تیۆریەوە). تالکوت پارسۆنز و دەستەکەی و پەیرەوکارانی خۆیان بەکۆمەڵەی شایانەی هاوچەرخی زانستە کۆمەڵایەتیەکان لەقەڵەمدا و لەسەر ڕۆخی ئەتککردنی نهێنییە کۆتاییەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی و لەسەر لێوی لەتبوونی گەردیلەی سۆسیۆلۆجیایی (هەروەکو جارێك بارسۆنز لەباسێکدا گوزارشتی لێکردووە) کە ئامۆژگاریی ئەمریکاش دەکات، لەوساتەوەختەی بارگرانیی کەوتە ئەستۆی پیاوی سپی پێست، لەبارەی چۆنیەتی بیرکردنەوە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی دیکە و هەر لەگەڵ لەدەستدانی زاڵیەتیش ئاژاوە هات، کەوەکو پەرتبوون و تەجریب وەسپکرا، دەگەڵ بەچاکتر زانینی لێکترازاندن، کەمەبەستیشی (وێڕای ئەوەی ئەو بڕگەیە بەتەواوی لەچەندین وشەدا وانالێ) پاشگەزبوونەوە بوو لە زاڵیەتی پێشوو.

هەردوو دانەری کتێبەکە، بەڕای خۆیان، پشت دەبەستن بەبنەماکانی ئەنترۆپۆلۆجیای "تەفسیریانە"ی کلیفورد گیرتز، بەڵام ئەوان بە قۆناغ رەتی دەدەن،



هەروەك پێشتریش بینیمان، رابیتۆ سەرنجی داوە، دەگەڵ لەمسەیەك لە تەنازول، کە بالاٚ دەستی ئەو بەدیاردەخات، گیرتز هێشتاکە بە شێوەیەکی گونجاو لەئەنترپۆلۆجیا دەدوێ و گەرچیش بەیاریدەی وەرچەرخانە تەئویلیە نوێیەکە بێت، لەکاتێکدا جیمس کلیفورد تەنیا لە ئەنترۆپۆلۆجیانی دەکۆڵیەوە، وەلێ گیرتز بەمسۆگەری پێشینەیەکی بۆ ئەو پەیوەستیەی (پۆست مۆدێرنیزمانە) چێکردووە، کە جیاو دیارە لەنێوانی زاڵیەتی و کۆشش بەدوای ئامانجی ڕوونی و بابەتیانەیی، بەڵام کاتێ کەمارکۆس زانستی کۆمەڵناسی و وەزعی و زاڵیەتی ئەمریکایی لێکبەستەوە، ئەوە گیرتز بەشێکی گرنگی کتێبەکە بۆ لێکبەستنەوەی ئەنترۆپۆلۆجیای مالینۆفسکایی کلاسیکی یا فێرگەی بەریتانیایی، بەزاڵیەتی بەریتانیایی و دەستڕۆیشتوویی ئیمپراتۆریایی تەرخانکرد. وە بەبۆنەی قسەکردن لەسەر شێوازی بەریتانیایی بۆ ئەنترۆپۆلۆجیا (لەهەردوو واتای وشەی "شێواز") گیرتز بەجیا بەلای ئیدوارد ئیڤانز — بریچارد بەتایبەتی، دەڵێ(٤١):

(وادێتە بەرچاوم وەکو بڵێی "شانۆیەکە بۆ زمان" خودان هێزیکی بێشومارە — لە ئیتنۆگرافیا، زێدە بەهێزتر لەوانەی تاکو ئێستا بنیاتنراون، لەوەی بە فێرگەی "بەریتانیایی" بۆ ئەنترۆپۆلۆجیای کۆمەڵایەتی، ناودەبرێت، زۆر زێدەتر یەکدیگیرە لەمیانەی گوزارشتکردن لەشتەکان بەپەخشان بەبەراورد لەگەڵ هەر جۆرێك لەو تیۆرە پەسەندکارییە نەنوسراوانەدا.

لەبەرئەوە نابێ بەد فامانە لەپرۆسێسی ئامادەگییەتی ئەو جیاوازکارانە بۆ نێو جیهانی درکپێکراو، بگریت، لەمیانەی دەربڕینە قووڵە ئینگلیزییەکان، ئینجا تەئکیدکردنە سەر زاڵیەتی و دەستبەسەر داگرتنی ئەو دەربڕینانە "بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا "... جیاوازیان لەئێمە... لەدووایی‌دا چ بایەخێکی زۆری نییە).

گیرتز لەگەڵ ئەو زاڵییە هەرەمەکییە و ڕوونییە دیارو جیایەی ئیڤانز — بریچارد و ئەو نوسینانەی دوای ئەمەش نییە (٤٢):

(بەلای چەندین ئەنترۆپۆلۆجیا ناساندا، وادیارە ئەو متمانەیەی ئەو گوتارە پێی بەخشی خودکلۆمدەرە ... بۆ ئیڤانز — بریچارد کەم و کەمتر لەئارادایە، کارەکەش

هەربە هێندە ناوەستێ تەنیا ڕووبەڕوو بونەوەیان بەهۆی کۆمەڵگە نیوە نوێ و نیوە تەقلیدییەکان، بەڵکە بەهۆی هەلومەرجەکانی کاریی مەیدانی ئەو ئاڵۆزکاوییە شپرزەیە ئیتنییانە و بەهۆی رستێك لە لێکنزیکایەتی دژیەکەکان بۆ بەربەرینتر مەودای وەسپکردن و شیکردنەوە، و بەو — سەبژێکتیڤانە - ەی (خودەکان) بەڕاستی هەڵدەستن و دەتوانن لەجیاتی خۆیان بدوێن.

سەرەڕای شەکەتبونیان بەهۆی ئەو گومانە ناوخۆییە ترسناکەی، کە نزیکەی دەگات بەجۆرێ لە وەسواسی(مالیخۆلیا) دەردەدارانەی ئەپستمۆلۆژی، لەوەی پەیوەستە بەوەی داخوا چۆن مرۆ دەکرێت بزانێت چۆن دەکرێت هەرشتێك کەسێکی دیکە دەیڵێت لەبارەی ئەشکالیەتی دیکەی ژیان -زیندەیی -، لەواقیعدا دەکرێ وابێت).

لەوکاتەی گیرتز ئەمەی نووسی، نەخۆشی وەسواسی هەبوو، هەروەکو لە یورکشایر دەڵێن، لەقۆناغی منداڵی دابوو، لەوکاتەوەش نەشونمای کرد و هەراش بوو تابوو بە کەڵە پیاوێکی بیرتیژ و چوارشانە، بینیشمان — قومە، مژە - میانڕۆکەی، کە گیرتز پوختی کردەوە بەچەند قۆناغ لەلایەن خەلیفە هزرییە بوێرەکان، ترازا، ئەوانەی ئێستا نکۆڵیان لێکرد بەوپێیەی نەگوماندار بوو و نەراراش بەوێنەی هاملت ونە پابەندبوو بەخود و نە تارادەیەکیش بەپێی پێویست پۆست مۆدێرنیزمیش بوو.

دەستکەوتەکانی گیرتزیش هەرچەند و چۆن بن لەبواری ئەنترۆپۆلۆجیادا، ئەوە لاکردنەوەی لەڕێژەگەرایی واتە پەسندکاریی و کۆکییە لە زێدەڕەوییەتی ئەوانەی ئامادەن "بیترازێنن" بەهۆی ئەو ڕێگەیەی ئاماژەی پێدرا.

یەکەمین وەسواسی (مالیخۆلیایی) دەردەداریی تەنیا پەیوەست بوو بە کۆڵۆنیالیزمی کرێت ودزێو، قۆناغی دووەم، بەپێچەوانەوە بەنەمانی زاڵیەتی ئەمریکی دەبەسترێتەوە، هەروەها ئەو گوشادییەی بەمیرات بۆی مایەوە ئەمەش بۆ هەندێ ئەندامانە لە پیشەوەریی ئەکادیمیای ئەمریکی.



هەڵبەت بەو جۆرە ئاخاوتنە مرۆ دەکارێ تێکڕای ڕێبازەکە تورهەڵدات، ئەو هەڵوێستە نمایشکارانەیە بەپێی پێویست سنوری بەزاندن، گیرتز نەوەیەکی تەواوی لە ئەنترۆپۆلۆجیەکان هاندا بۆ خستنەڕووی ئەوەی لەناخیدایە لەو مالیخۆلیایە و بێتوانایی ڕاستەقینە یا دەستکردانە، ئەمەش بە بەکارهێنانی نوشتووی گومان و کۆتی ئەپستمۆلۆژیایی وەکو پاساوێکی شیادار و بۆملنان ڕووە و ئەو پەڕ لە پەنهانی و سەبگێکتیڤیزم (دوونیشانە سەرەکییە شێوازگەرییەکەی "پۆست مۆدێرنیزم").

هەقیقەتی، بێتوانییان بۆ ناسینی خودی خۆیان لەلایەك و "ئەویدیکە" لەلایەکی دیکە، شەکەتی کردن، لەهەر کام ئاستەکانی پاشگەزبوونەوە و پاشەکشەکردن، بە جۆرێك چیدیکە پێویستیان بەوە نەما زۆر نیگەران بن لەبارەی "ئەویدیکە" و گەریش هەموو شتێ لەجیهاندا پەرت و فرە شێوەیە، ئەوە لەواقیعدا هیچ شتێ بەشتێکی دیکە ناچێ و کەسیش ناکارێ ئەویدیکە بناسێ (یاخود خۆی) و کەسیش لەتوانایدا نییە بەردەوام بێت، کەواتە چی لەتوانایە بیکات جگە لە گوزارشت کردن نەبێ لەو پەستیەی، کە ئەو بارە دەیخاتەوە بەشێوازێکی پەخشان ئامێزی داخراوی ئەوتۆ بەسانایی تێنەگەیت؟ .

چ پێویست دەکات کاتێکی زۆر لەکاری مەیدانی پێویست بەفیرۆبدرێ بۆ ناسینەوەی بارەکە و ئەو شەکەتی و مشەخەتیە جەستەییەی گەرەکیەتی؟ چون دەشکرێ لەدەردەسەری ئازار و نەشیانی درککردنی مەعریفە و راز و نیازە ناوخۆییە دەرونییەکەی لەقاوەخانەکانی پایتەختی دەسەڵاتی پێشووی کۆلۆنیالیزم رۆبچی، کە جارێك ناوچەی کاریی مەیدانی گریمانکراوی بەڕێوەبرد. هەروا دەکرێ بەتەواوی هەست بکرێ بە نەشیانی و مەعریفە و ژانێکی بەسوێ لەپاریسدا هەروەکو ئەوەی چیاکانی ئەتلەسی ناوەڕاست، بەڵکە لەڕاستیدا چاکتریش.

جگە لەوەی ئەمە دانوستانێکی سست یا شەکەتی گەرەك نییە بۆ مۆڵەت وەرگرتن بەمەبەستی ئەنجامدانی تۆژینەوە یا سەرەڕۆیی تووشبوونی بەمەلاریا یا مار پێوەدان، بەلاّم سەبارەت بەشێواز...، ئەو کۆڵۆنیالیزمانە زۆر بەڕوونی و

ئاشکرا نوسیویانە، چونکە دەستیان بەسەر جیهان داگرت و یەکێ لەو ئامرازانەی پالپشتی بوو بەکارهێنانی ڕوونی مەترسی ئازادبەخشابوو، شێوازی پەخشان ئامێزی ڕوون و بەرچاو و زالیەتی کۆلۆنیالیزمی یەکدیگیر و هاوکارن و لەمیانی شێوازی ئەدەبیەکەمان بۆیان ڕوونەکەینەوە تاچەند دژە کۆلۆنیالیزمی (سەربەئافرەتانین)! و سوێندیش بەخوا دەخۆم ئەوان بوون ئەمەیان کرد.

ڕەنگە تا دوورترین ڕادە تورِدانی ئەو سەبگێکتیڤیزمە بەو کۆتاییە تاڵەی سەرنجراکێش و وروژێنەر بێ، بەو پێیەی داهێنراوێکی بەسەرچووە و لەوەش زیاتر لەسەری نەڕۆیشت جگە لەوە، ڕەنگە، وەسپکردنێکی سۆسیۆلۆجی بۆ بخەیتەڕوو. رابیتۆ داوامان لێدەکات سەد لە سەد بەهۆی ڕێگە خەمڕەوێن وخۆشەکەی [43] ئەمە بکەین.

مرۆ دەبینێ دەربەستی بیرکردنەوەیە لەسیاسەتەکانی ئەمرۆی تەفسیری ئەکادیمی... ئەمەیە ڕەهەندەکانی ئەو دەسەڵاتەی نیچە هانیداین بۆ پشکنینی و ئاگاداربوونی، ناکرێ گومان لەهەبوون و کاریگەری ئەو جۆرە پەیوەندییەی دەسەڵات بەبەرهەمهێنانی دەقەکان نەکرێ...من گرەو دەکەم لەسەر دەستنیشانکردنی ئەو هەلومەرجەی بەهۆیەوە خەڵکی بەکرێ دەگیرێ و مافی وەرگرتنی پلەوپایە و مافی بڵاوکردنەوە و بەدەستهاتنی بەخشینەکان و پاداشت — یان پێدەدرێ، هەموو ئەمانە قەرەبووی ئەو ئەرك و ماندووبونەن.

من یەکێکم لەوانەی بەو بەرەنگارییە ڕازیم، بنەمابونیاتنەرەکانی ئەو سەبگێکتیڤیزمە زێدەڕۆییانەییە چین؟ .

لەزۆربەی وڵاتانی پێشکەوتوو، نزیکەی لەسەدا پەنجای دانیشتوان دەرفەتی خوێندنی باڵایان بۆ ڕەخساوە و لەو کۆلیج و زانکۆیانەی ئەوجۆرە فێرکردنە - خوێندن - پێشکەش دەکەن کادیری پسپۆڕ کاری تیادەکەن، کە تەنیا لەڕووی ئەدای وانە بێژی هەڵنەسەنگێنراون، بەڵکە بەگوێرەی توانا فیکری و ڕەسەنایەتی داهێنەرانەشیان بەپێی نمونەی گەشەکردنی هەمیشەیی زانستە سروشتیەکان و



نێوەندە زانستییە گەورەکان، چون زانستخوازان خۆیان لەسەر سەکۆی خودی زانستدا دەبیننەوە، بەڵام لەدەزگا فێرکارییە ڕۆتینیەکاندا و بوارەکانی وەکو زانستە مرۆییەکان، کارەکە هەر بەوەندە ناوەستێ ناڕوونی هەبوونی هەر گەشەیەکی کەڵەکە بووانە، یا هەر "پێشکەوتنێکی ڕاستەقینە"، بەڵکە هەمیشە و تێکڕا کرۆکی ئەو "توێژینەوە"یەی پێویستە یا دەکرێ پێیبکرێ ڕوون نییە، بەمەش، ئەو جیهانە هەمەکیەی خوێندنی زانکۆیی بەردەوام دەبێ بەپێی نمونەیێ دەکرێ بەسەر زۆرکەم لەو مەڵبەندانەی ئیمتیازیی داهێنەرانە و لەبواری زانستە سروشتیە بەرفراوان و کەڵەکە بوو بەشێوەیەکی ڕاستەقینە پیادە بکرێ، بەشێوەیەکی سادە، دەبێ قووڵی بیرکردنەوە و ڕەگاژۆیی داهێنەرانە، خۆدەربخەن، هەموو شتێکی مەبەستە لێی وێکچوونیەتی بە گەشەی پەرەستێنی زانستی، بەڵام ئەی گەر هیچ کامیان لەئارادانەبوو؟ ئایا ئەمە پەلکێشمان دەکات بۆ ئامادەکردنی نمونەیەکی دەستکردی سڕاوە و بەدواییەکدا هاتوو، لەشێوەی تەرزی جیاو دیاری پیشەسازکاری کاڵا بەکاربردەکان؟ لە قۆناغێکی دوای جەنگ، خواستی ئەو گەشەکردنە لەسۆسیۆلۆجیای ئەمریکی لە میانی بەرفراوانێتی لە زاراوەی زانستی بەدیهات، کە لەڕاستیدا نەخودان دیقەتی پێناسەکردن بوو و نەهیچ پەیوەندیەکی کردەنی بەواقیعی ڕاستەقینەش هەیە، نە گەلەك بە دیسپلینی ناوەکیش، بەڵام ئەو لەهەردوو لایەنی پەنهانیی و تۆقاندن گونجاو وشیاو بوو.

دوابەدوای ئەمە، لە ئەنترۆپۆلۆجیادا، یەکەمیان مگێزی "تەفسیری" هات، ئینجا بەردەوامبوونی ئەودیو نوێخوازێتی زێدەڕەویانە و ڕۆچوو لەخوددا و دەشکرێ هەریەك لەمانە بەو پێیەی دۆزینەوە و دەرفەتە، بخرێتەڕوو.

دووکار قەومان: هاندەری زانستیانە لەپێدانی هەر ئاکامێکی گەورە نوشوستی هێنا و ئەمەش بوو لەکۆتاییدا کەوتە بە ڕسەرنج، کاری مەیدانیش لە ئەنترۆپۆلۆجیای کۆمەڵایەتی زێدەگرانتر و شەکەتتر بوو بەشێوەیەکی یەکبەدواییەکدا.

چون میتۆدی حوکمی ناڕاستەوخۆ، کە بەشێوەیەکی فراوان لەژێرسایەی کۆلۆنیالیزم بەکارهات، توانی بونیاتی کۆمەڵایەتی ڕووت -پەتی - و دیار و پشتئەستوور بە تقوسەکان بپارێزێ، بەڵام لەجیهانی پۆست کۆلۆنیالیزمی دەسەڵاتدارانی نودا جارەهای جار بوونی ستراکتۆری کۆنی فەرامۆشکراویان ڕەتکردۆتەوە، لە کاتێکا بەڕێوەبەرە خۆیەتییەکان نەیارن بەتۆژەرە دەرەکیە غەوارەکان، ئایدیۆلۆجیەکەیان بەسەرچوو، ڕەتیدا، بێوەی دانبنێن بەستراکتۆری کۆن و بەرژەوەندییەکانیشیان بەئامادەبوونی چاودێرە دەرەکیە سەربەخۆکان کەوتنە بەر هەڕەشەوە، ئەوانەی ئازادبوون لەهاتووچۆ و جاڕدان و خستنەڕووی هەرچی ویستبایان لەزانیارییەکان، هەروەها رزگاربوون لە وەهمی هاندەرانەی خواستی زانستی و ئاستەنگە چەمکایەتی و سیاسیە بەربەستدارەکانی بەرهەوڵدانی دۆزینەوەی شتەکان، ئەوان لەسەر زەمینەی واقیعدا داوایانکرد وەرچەرخانەکە لەمەڕ سەبگێکتیڤیزمی -ڕێژەگەرایی - تەئویلییەوە بێت، ئەمەش کارێکی زۆر وروژێنەرە [٤٤].

دەکرێ مرۆ لەکاتی نوشوستی لەدۆزینەوەی هەرشتێك (لێرە پێویست بەوەناکات هەرچیەك بێ، مۆڵەت لەوەزارەتی ناوخۆ وەربگرێ بۆ ڕێگەدان بەبیرکردنەوە لەبارەی خۆت و جلەوشلکردن بۆ نیگەرانییە تەئویلییەکەت، ڕۆح و ژان و ژووروخەمەکانت بخواتەوە) بەڵام زمانە قووڵەکەی سەبگێکتیڤیزم بەتایبەت لەکاتی خواستنەوەی زاراوە هزرییەکانی بەقەرز لەبانکی چەپڕەوی پاریسی، ئەوە بەلای کەمی ڕەنگە بە هەمان ئەو پلە نادیارییە کاریگەر بێت،کە سۆسیۆلۆجیای زانستیانەیی پێشوو هەیبوو، ئەو کارەی ئەوە دەردەخات، کەتۆ نهێنییەکی لوغزدارت هەیە و دەبێ ئاشکرا بکرێت، ڕۆشناییەك دەبێ - ئامادەبێتەوە - بەکورتی شتێکت لایە تا ئەوانی پێ فێربکەی و تەلقین بدەی، هەروەك ڕێگە تەئویلییە گەیەنەرەکە بۆ یەکسانی ڕۆشنبیری — تێکڕای کۆمەڵەکانی واتا یەکسانن — لە نێوان فریشتەکانی سیاسەتمەدارانت دادەنێت.



دەکرێ تەنانەت زانستگەرایی (ساینتیزم - العلمویە) و سەبگێکتیڤیزم (الذاتانیة) بەیەکەوە بلکێن و کۆبکرێنەوە و لەلایەن جۆرج مارکۆسیش [٤٥] ئاماژە دراوە بەو بەیەکگەیشتنەی نێوان ساینتیزمی بەرایی و سەبژێکتیڤیزمی تەئویلی پاشی.

(لەوێدا کەمایەتی نییە لەو کارانەی کەوا لەو شتە دەکەنەوە، کە ئەنتۆنی گیدنز (١٩٧٩) بەگرفتی ناوەندی تیۆری کۆمەڵایەتی ناوی برد: تەکامول لە نێوان ڕوانگەی کاری کاراڕایی سەربە میتۆدی سەبگێکتیڤیزم، کە باڵی بەسەر بیری کۆمەڵایەتی ئەنگلۆ — ئەمریکی لەماوەی دوای جەنگ کێشا و لەنێوان واتای لایەنگری نمونەی(میسال - پارادیگم)ی تەئویلی تەفسیری).

بەڵام ئەوەی وادەکات ئەو زەبرەی ئەژدیهای مات و نادیاری کۆلۆنیالیزم دوای دەیان ساڵ لەفەوتانی، وەك نەبەردییەك بێ، ئەوە ئەمە شایستەی ئەوەیە لەپێناویا میدالت بەسینگەوە بکرێ، ئا ئەمە هێشتاکە ڕوون نییە بەلای منەوە(دەبێ بڵێین رابیتۆ خودی خۆی ئاماژەی بەو خاڵە [٤٦] کردووە، ئەو نیشانەی پێکاوە کاتێ سەرنجدەدا، ئەو سیاسەتەی ئاسەوارێکی کردەنی جێدێڵێ، ئەوە کۆلۆنیالیزمی دوێنێ نییە، بەڵکە سیاسەتی ئەکادیمی هاوچەرخە) هەروا دەکرێ داهێنانی ئۆرگینالێش بێتە ڕیزی بۆ وەدەستهاتنی دانپیانانێکی ئەکادیمی: گیرتز تێکڕای کارەکانی لەمیانی وەرچەرخانە تەئویلییەی لە ئەنترپۆلۆجیادا دەستپێکرد، بەڵام دەشکرێ بڵێیت ئەو بەپێی پێویست بۆی نەچوو — چونکە کاری پیاوەکە لێوانلێوە لەئاماژەداری مەرجەعی بۆ جیهانی ڕاستەقینە... درك بەوە ناکات هەر هەڵبەستە خۆدەرخستنێ، هەرچەندە هوشیارانەش بێت لەمەڕگەیشتن بەوجۆرە دەروازەیە هێشتاکە ڕیسواو گومڕایە لەڕووی هەست نەکردن بە گرفتە ئاڵۆزکاوییەکەمان؟ .

گرفتی مەعریفە، نەخاسمە گرفتی زانینی سەمتی چەمکایەتی نامۆی بیانی بووە هۆی فراژیبوونی گرفتگەلی قووڵی ناهەمواری بێچارە، دەکرێ مرۆش ئەو ئاستەنگانە بەکاربهێنێ بۆ ئاڕاستەکردنی توندترین ڕەخنە بۆ گشت ئەوانەی پێشتر دەرهاویشتەی ڕوون و فامکراویان — لەگەڵ گرفتەکان یا بەبێ ئەو — هێنا،

هەروەها خستنەڕووی نادیاری و ناڕوونییەکەی و وەرسوڕانی بۆ زاتێکی خودان گرێی کەماسیی، درەفشاوە بەو هەموو ناوەگەورانە لە مێژووی بیروباوەڕدا ، بەوپێیەی قوولترە. سەرەڕای ئەوەی ئەمە ئەرکێکی کەمتری گەرەکە، هەموو ئەمانە بەبەشێك لەتەفسیری "سیاسی" دادەنرێن.

هەروەها بۆچوونێکی ئاوها هەیە لەوێ ئاماژە دەدا بەوەی ئەو تۆقینە تەئویلییە لە "ئەویدیکە" بەوپێیەی بەجۆرێ پەیوەستە بە (شێوەیەك هەردەبێ وابێ؟) هاویەکسانییەتی لەڕێی ڕۆشنبیرێتی، پێش چاوکەوت: هەتا وەکو ئێمە نەئاخقی ئەوە تۆ کۆلۆنیالی، گەر خراپتریش نەبی، هەروەها بەو پێیەی مەرجێکی ترازاوی پێشوەختەیەو پەرەلێڵە، ئەو پێوەندە قەلپ و شلوخاوانە بەرچاو دەخات، بەلام مکوڕی و بەردەوامی لەسەر ئاماژە پێ کردنی بەڕێگەیەکی پەنهان، شاراوە، ئەنجام دەدرێ. جا لەبەرئەوەی رابیتۆ داوای لێکردووین تەفسیرێکی سیاسی بۆ حالەتی هێزو دەسەلات و بەرهەمهێنانی هەنووکەیی بخەیتەڕوو بۆ ئەو شانۆگەرییە نمایشکراوەی نێو بوارەکانی ژینگەی ئەکادیمی، من بەتەوازوعەوە ئەو گریمانەی گۆرین دەخەمەڕوو، لەگەڵ پێشنیازێکی بوێرانە، کە نیچە گوشاد دەکات، کە رابیتۆ هێنایەوە یاد، ئەویش تارادەیەك بەهەمان شێواز، هەروەك حەزم لێیە ئاوای زەنبکەم، دەیخاتە ڕوو.

چون نیچە و هاینە ئەوان بوون، کە پێوەندە کۆکەرەوانەکەیان ساغکردەوە لەنێوانی ئایدیالیزمی فەلسەفی ئەلمانیایی و ڕەوشی زیندەگیانەی ئەکلیدۆس و پسپۆرە زانکۆییە ئەلمانییەکان، بەلام ئەوەی جێی داخە، ڕەنگە دوایی وازهێنان بێ لەو ڕادەوئاستە، ئەو دووانەش بەهەرحاڵ دوو سەلەفی ڕاستەوخۆی سەبگێکتیڤیزم دەنوێنن، هەروا لەوێدا پێشقەرەولان هەن لەپێشینەکان زێدە قوول و گشتیترن، لەمەودواش ئاورێکیان لێدەدەمەوە.

ڕێژەگەرایی بەتەنیا خۆی لەوە نابینێتەوە لەوەیهەرچی لەبارەی دەگوترێ گوایە بە تەنیا وەکو هەقیقەتێك بێ و بەس، ئەمەش وادەکات وەك تۆژینەوەیەکی ئەوتۆ



لەقەڵەم بدرێ کرچوکاڵ وخودان شێوازی پەخشان ئامێزی تۆقینەر و گەلەك نادیاریی بەئەنقەستانەی بەریق وباق، بەهەرحاڵ دیاردەیەکی ئەوتۆ فۆرمەڵەدەکات تاڕادەیەکی زۆر بەپەلە بروەێتەوە، ونبوونیش لە کونجی لەبیرچوونەوە بە سەریا تواناداره، کاتێ بیدعە فیکرییەکەی ئەوەی دی دەگات، کاری هەرە زێدە گرنگ بریتیە لەدیاریکردنی ئەو هۆیە، کە هەر ڕێژەگەرییەك ئاوا بەسووك وئاسانی گونجاوو لەبار نابێت.

لەوێدا وتارێکی سەیر هەیە، جەخت دەکاتە سەر ڕایەکی دژ، کە لەگۆڤاری ئەمریکان ئەنترۆپۆلۆژیست — American Anthropologist — لە ساڵی ١٩٨٤ [٤٧] بەدەرکەوت، بەپێنووسی ئەو پیاوەی بەراستی زۆری کرد بۆ کارتێکردنە سەر ئەو بزوتنەوەیە و یادکردنەوەی ڕێسا بنەڕەتیەکانی، تەنانەت گەر خودی بزوتنەوەکەش ئێستا خواستی ترازاندنی بێت — ئەویش کلیفورد گیرتزە، گوتارەکە بریتیە لەبەرگریکردن لەڕێژەگەرایی دژ بەرەخنەگرانی، وێڕای دەرخستنی ئەوەی گوایە مەبەستی ئەو لێی مسادەقەکردنێکی بنەبڕنەبووە لەسەری، جا لە بەرئەوەی کارەکە ئاوهایە، ئەوە پتەوانە پەیوەستە بەو مەسەلەی ئێستامان و ئەو گوتارەش رژدە لەسەر وەسپکردنی خۆی بەوەی "دژ دژ"ی ڕێژەگەراییە و بەلای ڕێژەگەریی داناچێ و لەبەرئەوەشە کەوا بەکارهێنانی "دژە دژ — نقض النقض"کارێکی دزێوە و لەبەر ئەوەیش من ڕێزدەنێم لەئارەزووەکەی گیرتز بەوەی بە "ڕێژەگەرێتی" بەشێوەیەکی ڕواڵەتیانە وەسپی نەکەم، بەلام بێوەی بڕوام پێی بێت، ئەوا گوزارەی "لایەنگیری ڕێژەیی" بەبێ بڕیاری پێشوەختە بەکاردێنم، وەکو جۆرێك لە داشۆرین - پوختەکاریی - بۆ گوزارشی تیروتەسەلی (دژە دژ).

دانەرەکەی ئارامی لێبڕا لەئاست ئەوانەی بەڕای خۆی بەهەڵە لەحاڵەتەکە گەیشتبوون، بۆ نمونە، گاڵتە بەو پوختەکارییە نایابەی (ئیان جارڤی) دەکات سەبارەت بەڕێژەگەرایی "گشت هەڵسەنگاندنەکان... پەیوەستن بە پێوەرێ... پێوەرەکانیش لەڕۆشنبیریەکان سەرچاوەیان گرتووە"[٤٨] وێڕای ئەو هەقیقەتەی

خودی گیرتز لەکۆتایی گوتارەکە بەئاشکرا بەو شێوەیە سەد دەرسەد بەلای ڕێژەگەرایی دادەشکێتەوە و وێڕای ئەو هەقیقەتەی پوختەکردنەوەی نەهلیسیزملەلایەن جارڤیەوە لەو هەڵوێستەدا ڕوون و قایلکەرە.

ئەو خاڵە سادە بێهەست وخوستەی جارڤی و وروژاندنی بریتی بوو لەوەی گەر گشت پێوەرەکان تاکوتەرا گوزارش کردن بن لە ڕۆشنبیری (ناکرێ شتێکی دیکەش بن) ئەوە لەوێدا چ مانایەك نییە بەگشتی بدرێتە پاڵ ڕەخنەگرتن لە ڕۆشنبیریەکان ، ئینجا مەحاڵە پێوەرێك هەبێت بکرێ مەزندە یا وێنا بکرێت و بەم پێیەش دەکرێ ڕەخنە لە ڕۆشنبیریەکان بگیرێت،گەریش چارەنییە و پێوەرەکان گوزارشکارن لەڕۆشنبیریی، داخوا چۆن دەکرێ حوکم بەسەر ڕۆشنبیریەك بدەین؟ وا پێدەچێ گیرتز بە شێوەیەکی سەیر لەئاست ئەو مەترسیە ڕاستەقینە و پاساوداره گشتیانە، چاوی نوقاندبێ، وێڕای ئەو گاڵتەجاڕییە نەگۆڕ و ڕیسوایی و بێ بەڵگە و بیانووە، ئەو تەنیا لەمیانی هانابردنە بەر هەقیقەتێ کە ئەو "عەدەمی نییە" هەروەها ڕەتکردنەوە و نیشاندانی ئەوەیش (بەبێ بەڵگە) بەوەی عەدەمیەتە ڕاستەقینەکان ناچنە ژێررکێفی ڕێژەگەرایی ئەنترۆپۆلۆجی و بانگەشەی ئەوەی گوایە شتێ بە - لادێیانە — ناوزەدکراوە، ئەوانەن زێدە کوشندەتر لەڕێژەگەرایی.

ڕێژەگەرایی بەناچاری پەیرەوی نەهلیسیزم دەکات، گەر پێوەرەکانیش گوزارە گەلی هاندەرانەن، بەشێوەیەك ناچاریانە بۆشتێ پێی دەڵێن ڕۆشنبیریی و ناشکرێ جگە لەمە شتێکی دیکە بێ، کەواتە ناکرێ چ ڕۆشنبیریەك ملکەچی پێوەر بکرێ، چونکە (بەپێی گریمانەی گۆرین) چ پێوەرێك بەڕێگەی ڕۆشنبیریی بوونی نییە بەمەبەستی/ یا لەڕووی سەنگی مەحەك، بەڵگەیەکی زێدە سادە و قایلکەرانە لەمە لەئارادانییە و ڕاستی ئەوەیش کە ئەو پەیرەوکردنە ناچارییە ڕاستەو لەبارە، مانای ئەوەنییە کە لەسەر خەڵکییە لەواقیعدا بن بەعەدەمی لەڕووی سایکۆلۆجیش گەرهاتوو ڕێژەگەرییانە بوون، بەڵگەکەش بەو هەقیقەتە پوچەڵ ناکرێتەوە گوایە نوسەرەکەمان لەگەڵ ڕێژەگەرایی هاوسۆزە و پێوەرەکانی تایبەت بەخۆی هەیە، کە بەتوندی بەخۆی گرتووە، ئێمە ناکارین



ڕێبگرین لە بەیەکدا هەڵشاخان و ناکۆکی و ئارەزووی ئەنجامدانی ئەمەشمان نییە، هەروەهاهەبوونی ناکۆکی (دژیەکیەکی)لەئەقڵێکی دیاریکراودا بیانووو بەڵگە پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵام لێرەدا هەندێ لە ئێمە، ئەوانەی دەرەنجامە کرۆکپەکان کاری تێکردن و نیگەرانیکردن و ئەوانەی ئاستەنگێکی گەورە لە پەسەندکردنی پێشەکییە لۆجیکییەکەی - ئەلیف - و ڕەتکردنەوەی ئەنجامی - بێ - نابینن، کەواتە (هەروەك بە تەئکیدکردنێکی پشتەئەستورانە لەو حاڵەتە ڕوودەدات) بەڕاستی — ئەلیف- شوێنپێی- بێ — کەوت.

گیرتز بەدووردرێژی دەئاخڤێ: من خۆم وەك گشت، لادێگەرایی (PROVINCIALISM) بەو سەروبەرکارە ڕاستەقینە گەورەیە دەبینم لەمەڕ ئەوەی تاکو ئێستاش بە کردەنی لەجیهاندا ڕوودەدات " (واتە: مەترسیەکی زێدەهەرەشەکارە بە بەبەراورد لەگەڵ ڕێژەگەرایی) هەروەها دەڵێ "دژە ڕێژەیی بەشێوەیەکی گشتی کاری لەسەر ئەو بەدرۆ خستنەوەی ئەو نیگەرانییە کردووە کەلەسەری دەژیت " [٤٩].

ئەو پرسە پرسی حوکمدانە و بەهەرحاڵ ناتوانم بەمە رازی ببم، ڕەنگە بڕێکی زۆر لەو لادێگەریە ڕواڵەتیانە هەبن، بەڵام لەبواری ژینگە ئەکادیمییەکاندا داهێنراوێکی ڕەوتارنییە جگە لەڕێژەگەرایی نەبێت.

دژە فیکریە گرنگە جیاوازەکەی ڕێژەگەرایی کە گیرتز داکۆکی لێدەکات (وێڕای ڕوونکردنەوەی بەوەی تەنیا بەدوژمنەکانی ناکۆکە و بەزەرورەتیش سەربە ئەو نیە) هەڵبەتە بریتیە لەبنەمای خەندەقێکی گەورە و بیرۆکەکەش ئاماژە دەدا بەوەی کەوا دابڕانێکی گەورە لەژیانی ڕەگەزی مرۆیی ڕوویداوە، هەروا لەو ڕایەوە خۆی دەنوێنێ کەوا هەبوونی شێوەیەك لە مەعریفە باڵا دەست بەسەر هەموو شێوەکانی دیکە، لەڕووی هێزە ئیدراکی و سەختییە کۆمەڵایەتیەکەی بەیەکەوە. چیدیکە لادێیگەرە — ڕەهاکارەکان لەنێوانماندا جێگەیان نابێتەوە، بەلای کەمی وەك ئاشکراوروونە لە پێگە ئەکادیمییە بە شۆرەتەکاندا، بەڵام ئەو بیرۆکەیەی دەڵێ دابڕانێکی سەرەکی و

چارەنووسساز لەمێژووی بیری ڕەگەزی مرۆیی — وێڕای مەحاڵی بەکارخستنی بۆ گەلەك پێدانی سیفەتەکان بۆ هەر توێژێکی دیاریکراو لە مرۆگەل — ڕوویدا، کەبەهەڵوێستێکی ئەوتۆ دادەنرێت شایستەی ڕێزلێنانە. بەلای کەمی بەو هیوایەی هەروەك دەیزانم وابێ. گیرتز ئەو ڕایە هەڵدەبژێرێ بەمەبەستی ئاڕاستەکردنی هەندێ گاڵتەجاڕی، بە بەراوردکردنی ئەو لەخۆباییە هەڵبەستراوەی ئەوانەی بەڕێزەوە لەبەردەم ئەو ڕاستیە ملکەچن و دەگەڵ غروری ئەوانەی باڵا دەستیان لەسەر هەبوونی دەمانچەیەکی پڕوپوچ چێدەکەن[٥٠].

لەواقیعدا گیرتز بەتەواوەتی هەڵەیە لەبەدواداچوونی بناوانی ئەو ڕایە، لە پەراوێزێکدا[٥١]. زنجیرەیەکی تەواوی لە داڕژتە فرەجۆرەکانی تیۆری گەورە خەندەق خستەڕوو، ئینجا گەپاویانە شایەتی هێناوەتەوە بە "پۆپەر، ئەوەی ئەو هەموو خێروبێرە موبارەکەی لێ هەڵڕژاوە" لەسەر مرۆیە لێرەدا بەتەواوەتی ژمارەی پێوانەیی تۆمار بکات، بەوپێیەی ئەندامم لە بزوتنەوەی گەورە خەندەق و لایەنگیری تێزی گەورە دابڕانم، دەبێ جەخت بکەمە سەر ئەوەی کارل پۆپەر، بەڕای حزبمان، بەهاوڕێیەکی حزبی دادەنرێت بەدەست گرفتێکی کوشندەدا دەناڵێنێ و لەڕاستیدا کتێبە مەزنەکەی کۆمەڵگەی کراوە و دوژمنەکانی[٥٢] بەجۆرێکە هێندە یەکدیگیرانەو یەکبەدواییەکدایە لەوەی پەیوەستە بە ناتەبایی نێوان کۆمەڵگە داخراو و کراوەکان، بەو پێیەی ئەوەی دوایی گرێدراوە بە ئازادی زانست، یەکەمیشیان لە هەردووکیان بەدوورە. بەڕاستی تەنیا تا ئەوڕادەیە توانی هەندێ یارمەتی و پشتیوانیمان پێبدا، بەڵام لەو ئەدگارە جیایانەی بیری پۆپەر نوشست هێنانی بوو لەگرێدانی ئەو ناکۆکییە بەهۆی هەر ڕێگەیەکی بەردەوام، یەکبەدواییەك لەگەڵ جیاوازییەکانی دیکە لەفۆڕمی کۆمەڵایەتیدا و ئەوشتانەیشی پەیوەستە بەوەوە، واپێدەچێ ئەو بڕوا بەوە بکات، کە ناوەڕۆکی بیری زانستی (شتێکە بەرای ئەو تەواو سادەیە، واتە تاقیکردنەوەی هەڵە و ڕاست) هەر لەگەڵ دۆزینەوەی بوونەوەرانی تاك خانە، لەگەڵمان بوو، کاری ئاینشتاین لەڕووی



بنەماوە[٥٣] لە کاری ئەمیبا جیا نییە و بەمەش لەوێدا نەبڕانێکی ڕاستەقینە و نەبوونی سەنگەرێکی گەورە لەئارادایە و زۆریش بایەخی نەداوە بەهەوڵدانی پشکنین و تاقیکردنەوەی ئەو مەرجە پێشوەختە کۆمەڵایەتیانەی کرانەوەی هزری، جگە لە خستنەڕووی جۆرێك لەگفتوگۆی شەرمنانەی بەڕاستی و ناسەرەکی تاڕادەیەك لە بارەی پەیوەست بوونی بەڕۆحی سەرکێشانەی بازرگانی ئەویش بەگشتی سەمتێکی ئاوا دەخاتەوە، ڕۆحی کراوە، وێڕای ئەوەی ئاخۆ لەیۆنانی کۆن یا ڤییەننای کۆتایی سەدە ڕوویدابێ، لە دەرەنجامی ئاوێتەیەکی تاکەکەس سەربەخۆ لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە لەپاڵەوانێتی و تەوازوعەوە هەڵدەقوڵێ، ڕۆحێکی سەربەستی نەبەرد دووبارە خووە دێرینەکەی ئەمیبا دووپات دەکاتەوە و زێتر گومان لەبیروڕاکان دەکات لەوەی بیانپارێزێ و بەرەنگاری ملنان دەبتەوە ڕووە و تیرەگەرێتی داخراو، کە بەهۆیەکی ناڕوون و نادیار کاری کرد بۆ پەکخستنی کولتوری کراوەی ئەمیبایی لای ڕەگەزی مرۆیی.

خاڵی پەیوەست بەمەترسی گەورەی لادێگەریانە دلارامە، بەڕاستی مایەی گرنگی پێدانە، نوشوستی لە درکپێکردنێکی وردانە یا تێگەیشتنێکی تەواوی فرەجۆری جیهان لەڕووی ڕۆشنبیریەوە، لەڕاستیدا، مەترسیەکی هەرە هەڕەشەدار دەنوێنێ لە ئەمریکای باکور لەچاو ناوچەکانی دیکەی جیهان.

کۆمەڵگەی ئەمریکای باکور، کە هاوچەرخانەتر لەدایکبوو لەو توخمە بنجداکوتاوانەی نێو کۆمەڵگەی ئینگلیزی، کە ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لەسەرهەڵدانی جیهانی نوێ، هەڵقولاو نەشونومای کرد، ڕێککەوتیش نەبوو ماکس ڤیبەر بەجۆرێ بەشێوەیەکی سەیر، ئەمریکیەك لەسەدەی هەژدەهەم هەڵبژێرێت ئەویش بنجامین فرانکلینە، تا شتێك شلۆڤە بکات، ئینجا ئەو ویستی بیڵێ لەبارەی ڕۆحی ئینگلیزی باو لەسەدەی حەڤدەهەمدا.

سەرەڕای ئەوەش دەکرێ ئەمەش بخەیتە سەر سامانی خورافی ئەمریکا و تارادەیەك بڵاوبوونەوەی بەو شێوە فراوانە، بەشداریەکی بەرفراوان (گەرچیش

هەڵبەت ناتەواو بوو) لە نموونەی ڕۆشنبیری نیشتیمانی و یەکسانێتی و جەخت کردنە سەر بزاوتی کۆمەڵایەتی و سەرباری هەموو ئەمانەش نەبوونی هەر بیرەوەریەکی ڕاستەقینەیی تەنانەت هەر ئاسەوارێکی بەجێماو لە هەر ڕژێمێکی بەسەرچوو — ئەمانە هەموو ئەو نیشانانە وایان لە ئەمریکیەکان کرد، تا ئەمڕۆ، خۆیلەخۆیدا مەیلدار بن بۆ دابڕینی سیفەتی ڕەهاگەریی بەسەر فەرهەنگە تایبەتیەکەیان و یەکسانێتی کردنی بە ڕەوشی مرۆیی، دەرەنجام مامڵەکردنێکی نەستیانە -لاشعور- دەگەڵ ڕۆشنبیریەکانی دیکە بەو پێیەی لادانگەلی سەرلێشێوانەن لەڕەوشی مرۆیی ڕاست و دروست.

ئیندیڤیدوالیزم، یەکسانێتی، سەربەستی، ئەفراندنی داهێنەرانەی بەردەوام، ئەو تایبەتمەندیە جیاو دیارانە، لە چوارچێوەی بەراوردکاریی مێژووی جیهانیدا، نائاسایین، گەر نەڵێین نامۆو ناوێزەن، بەڵام بەلای ئەمریکیەکان بەشێکە لەو هەوایەی هەڵیدەمژن و زۆربەی هەرە زۆریشیان هەرگیز چ کەشێکی دیکەی ئەخلاقی تاقی نەکردۆتەوە و تاکە فەلسەفەی خۆماڵی ئەمریکی پراگماتیزم، بەڕاستی خۆی لەخۆیدا هەڵدەستێ بەگۆڕینی ئەفراندنی ئەزمونگەریی بۆ بەشێکی بنجدا کوتاوو ڕواڵەتییانە لەستراکتۆری ئیداریی مرۆیی، بەمەش بە تەواوەتی لەئاست ونبوونی لەزۆربەی ڕۆشنبیرییەکانی دیکە، چاودادەخات.

گومانی تیا نییە، ئەمریکیەکان مەیلی مامڵەکردنیان لەگەڵ ئەو بنەمایانە هەیە، بەوپێیەی گەردوونیی و گشتگیر و بنجداکوتاون لەنێو جەرگەی حاڵەتی مرۆیی. دیباجەی بەڵگەنامەی جاڕدانی سەربەخۆیی، ئەمریکیەکان فێردەکات، ڕاستیەکانی دەردەخات و ئەمریکیەکانیش ئابەم شێوەیە ئارەزوویانە - گریمانەیی-بێ. بەڵام لەواقیعدا ئاوا نییە، ئەو دەرخستنە گریمانییانە لەڕاستیدا — هەرتەقیانەیە - یا ناڕوون و پەنهان بەلای زۆرینەی فەرهەنگەکانی دیکە و گەشتوگوزار و جیهان ناسیی...تد، بەلکە نەبۆتە هۆی بەڕاستی داخورانی وەهمی ئەمریکایی. ئائەمەیە کە لەئەمریکا تاموچێژە وروژێنەرەکەی دەدات بە پەیامە



تەئویلیەکە، کاتێکیش لەکۆتایی دا ناوەندی ئەمریکی لە پەیامەکە دەگات، وا چاکترە یا ڕاسترە بەتازەیی و کەیلدار بیبینێ و ئەمەش لەرووی دڵە — هەر هەمووەکە - ی دابە دێرینەکانی بیرکردنەوەیدا.

لەوێ شوێنی ئاوا هەن لەجیهاندا — وەکو بەندەرەکانی خۆرهەڵات - هەر فرۆشیارێکی گەڕۆك لەشەقامدا تەواو ئاشنای چەند زمانێکە و زۆریش هۆگری تایبەتمەندیەکانی چەند فەرهەنگێکە، لەگەڵ ئەو ئاخێوەرانە، پەیامی ڕێژەگەرێتی تەنیا ڕاستیەکی جارسکەرانەی دووپاتەییانە بەرهەمدێنێ، بەڵام لەنێوەندی ئەمریکی هێشتا ئەمە تەبای ئاشکرا کردنی ڕاستیەکی تازە، دێت.

هەڵبەتە ئەو هێندە شیمانەییە شاراوەیە لەرادەبەدەر قۆستراوەتەوە، ڕاستی بەدیهیش — مانا دەلالاتیەکان لەگەشت ڕۆشنبیریەکان یەکسان نین - وەکو دۆزینەوە(ئاشکراکردن)، وەکو شتێ ئەرکێکی مەعریفی و دژوار و ئاگادار بونێکی تایبەتکارانەی ڕۆشنبیریشی گەرەکە.

بەتەواوەتیش، هەڵبەت بەلای گیرتز پەسەندە کەوا ئەرکە مەرکەزییەکەی ئەوە بێت، ڕۆشنبیرکردن و ڕاستکردنەوەی ئەوەی بەلادێگەرایی (PROVINCIALISM) یانەی ساویلکانە لای هاووڵاتیانی لە قەڵەمدەدا، بەڵام گەر واشمان دانا ئەو لادێگەرییە هێشتا باووبەربڵاوە —حەزیش ناکەم مل وەبەر ئەو کێشەیە بنێم، بەهۆی ناشارەزایم لەنێوەندی ئەمریکی - ئەمە ببڕای ببڕ پاساونییە بۆ ڕەخنەکاریی و سەرزەنشکردنی هەستکردن بە مەترسی ئەو عەدەمیەتەی لە ڕێژەگەرایی و گاڵتەکردن پێی، هەڵقولاوە، هەروەها لەناولێنانی ئەو جۆرە ترسە — لەنێو ئاپۆڕەی تەواوی قسەی ناشیرین و جنێوە هەمیشەییە زاڵمانەییەکان (ئینزارێك لەمەڕ مەترسیەکی ناراست...تد) مەترسیەکی هەرگیز "درۆزنانە یا هەڵبەستراو" نەبوو، بەڵکە تەواو ڕاستەقینەبوو، جا شوستیە سەیرەکەی گیرتز لەرووی هەستکردنێتی — سەرباری ئەمەش، سێنترالیەتی ئیتنی و دەمارگیری و ناشلێم لادێگەرییە ڕەگداکوتاوەکەی — چی وای لە رادەوئاستی هەرەشەکەی کەم ناکاتەوە .

بابەیەقینەوە هەرچی گومانە پەیوەست بەوەی داخوا گیرتز بەراستی ڕێژە گەرێتیە وتەنیا "دژەکەی ڕێژەیی"نیە، بەلاوە بنێین. لەسەرەتای گوتارەکە، بەهەرجۆرێ لەپرسەکە خۆی بەدوورگرت و پێچی کردەوە، لەرووی ئاماژەدان بەوەی گوایە"ئەنتی دژە ڕێژەیی" لەپابەندبوون پێی، ناگلێنی[٥٤] یا شکستی پێناهێنێ .

(لەو چوارچێوەیەدا، نەرێی -سلب - دووسەرە، یا نەرێی نەرێ، سادەییانە بەپێی ڕێگە باوەکە کارناکات، چون مرۆ دەکارێ شت ڕەتبکاتەوە بەبێ خۆ تێوەگلاندن ئینجا لەوشتەیشی ڕەتیدەکاتەوە، ئەمەش ئەوەی من دەمەوێ سەد دەر سەد لەگەڵ دژە ڕێژەیی بیکەم).

بەڵام لێرەدا پێویستیمان بە تکاکاریی بەکارخستنی تەقلیدی نەرێی نەرێ لە لۆجیکدا نییە، بەشادیەوە دەکرێ کۆك بین لەسەر بەکارخستنێکی ناوێزانە بۆ نیشانەی دژە دژ (ئەویش بەتەواوی ڕاستە، گەرچی ئەو بەجۆرێ بەشێوازێکی سەیر دایدەڕێژێ "دژەکە" هاوزایەکی وردی نەرێ نییە. بۆنمونە: دەکرێ بەتەواوی نمونەی تایبەتی گیرتز بەکاربێنین، دەکرێ مرۆ دژ بە میکانیزم بێ، بێوەی سەربە کۆمۆنیزم بێت و بەبێ لایەنگیرکردنی ئەو شتەی کە مەکارسیزم ((مەکارسیزم : ڕەوتێکی هزرییە لەسەرەتای دەیەیساڵی ١٩٥٠ لە ئەمریکادا پەیدابووناوەکەی لە ناوی جۆزیف مەك مەکارتی وەرگیراوە کە سیناتۆرێکی ویلایەتی ویسکانسن — یئەمریکی بوو، هەروەها دوژمنی سەرسەختی لیبرالەکانی ئەو وڵاتە بوو/ ب.ح)) سەرزەنشتی دەکات) دەکرێ دوا دەستەواژەی لەگوتارەکە بەکاربێنن، کە پێناسەیەکی لەخۆگرتووە بەشێوازێکی زۆرێك لەبارەی ڕێژەگەرایی و پەسندکردنێکی زێدەڕۆییانە، ئەویش سوکایەتی بەوانە دەکات سەرقاڵن بە "دانانی فەزیلەی ئەخلاقی لەدەرەوەی چوارچێوەی ڕۆشنبیریی و مەعریفە (ئەپستمۆلۆژیا) ئەودیو تخوبی هەردووکیان... ئەمەشە ئیدیکە ناشێت".

نکۆڵیکردن لە شیمانەی هەبوونی فەزیلەی ئەخلاقی لەودیو تخوبی ڕۆشنبیریی و مەعریفەو لەدەرەوەی جوغزی هەردووکیاندا، لەڕاستیدا تارادەیەکی زۆر



پێناسەیەکی پەسندکراوە، منیش دلّشام بەبەکارخستنی هەر هەمووی. نکۆڵیکردن لە توانستی هەبوونی مەعریفە لەودیو چوارچێوەی ڕۆشنبیریی جەختکردنە سەر ڕێژەگەراییە(سەیرە بڵێ ئەمە ناشێ، ئەو بەڕوونی ئاماژە دەدا کە ئەمە لەپێشان دەشیاو مسۆگەریشە، بەپێی لۆجیکی گریمانەکانی، واپێدەچێ تەنیا ئەوە بشێ...؟ بەڵام با ئەمە بەلاوە بنێین)، لێگەڕێن دەبا شێوازی دەسەڵاتی گریمانەکراو بەهۆی پێناسەی گیرتز پەسەندبکەین، خاڵەکە ئەوەیە — ئەوەی ئێمە زۆرمان پێویست پێیەتی سەد دەر سەد هەبوونی فەزیلەی ئەخلاقیە لەو دیو جوغزی ڕۆشنبیریی و مەعریفەوە لەو دیو جوغزی هەردوو فەزیلەی ئەخلاقی و ڕۆشنبیریی. بەم حاڵە وەکو بڵێی ئێمە ئەو چەمکەی دواییمان لە دەست وچنگ دابێ، نەك ئەوەی یەکەم منیش لێم مسۆگەر نیە داخوا ئێمە خاوەن فەزیلەیەکین لەدەرەوەی چوارچێوەی ڕۆشنبیریی یا نە، بەڵام متمانەیەکی ڕەهام هەیە بەوەی ئێمە بەراستی مەعریفەیەکمان هەیە لەدەرەوەی چوارچێوەی هەردووك چەمکی ڕۆشنبیریی و فەزیلەدا. ئەمەش، وەك چۆن حاڵەتەکە وایە، لەهەمان کاتدا بەرەو سەرکەوتنی دەبەین، ئینجا کارەساتێك رووبەرووومان دەبێتەوە و لەڕاستیشا ئێمە ئاوا دەکەین، ئەوەی هەیە تاڕادەیەکی زۆر ئەو خاڵە مەرکەزییە زێدەگرنگەیە لەوەی پەیوەستە بەڕەوشە هاوبەشە کۆمەڵایەتیەکەمان و چ سیستەمێکیش نکۆڵی لەوەبکات وەکو "ئەنترۆپۆلۆجیای تەفسیری" بە لایەنگیرییەتێکی تۆقێنەری حاڵەتە ڕاستەقینەکەمان دادەنرێت.

هەبوونی مەعریفە لەڕێگەی ڕۆشنبیریەوە، کەهیچ سیفەتێکی ئەخلاقی نیە هەقیقەتەکەی (الحقیقە — بەئەلفولامی تەعریف) هاندەرو بزوێنی ژیانمان بنوێنێ. منیش نالێم ئەمە کارێکی چاکە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕەها لێم مسۆگەرە، کە هەقیقەتێکی واقیعیە.

ئمەش دەبێ خاڵی دەستپێك بێت بۆ هەر ئەنترۆپۆلۆجیایەکی گونجاو یا بیری کۆمەڵایەتی هەرچەندە پڕبەپێستی خۆیمان نەبێ، بەڵام لەکاتێکی گونجاودا زیاتر لەبارەی ئەو بابەتە دەخەینەڕوو.

بەدفامییەك ڕەنگە هەبێ پێویستە بەلاوەی بنێین و مکوڕی و پێداگرتنیشم لەسەر ئەوەی ڕێژەگەرایی بەزەرورەتی لۆجیکیانە دەبێ بەنەهلیسیزم (وێڕای ئەوەی داخوا تاکەسەکان لەڕووی سایکۆلۆچی و بەشێوەیەکی کردەنی ئەمە بە ئەنجام دەگەیەنن یا هەست بەهێزەکەی دەکەن) ئەو بەڵگە دەداتە دەست، کە ئەو بەڵگانەی دەیانخەمەڕوو — دەیانهۆیێنیێ - بەو پێیەی عەدەمیەت کێشەیەکی ناکۆك و دزێوە، لەبەرئەوەی ڕێژەگەرایی پێویستی پێیەتی، کەواتە دەبێ ڕێژەگەرایی قەڵپ ونادروست بێت. شتێك لەم ڕووەوە پێشنیاز ناکەم و هیچ کاتێکیش ڕام وانەبووە ئەو گەردوونە بە تایبەت بۆ ئاسودەییمان ڕێکخراو و سیستماتیزەکراو بێت.

یاخود بۆ گوشادی یا ڕۆشنبیریکردنمان، جگەلەمە بیروڕا بەیەك جیاوناجورەکان ڕاست نین، بەڵکە یەپێچەوانەوە، گەر چ جیاوازیەك هەبێت، ئەوە من مەیلی ڕای بەرامبەر و بەدبینم و تاڕادەیەکیش لایەنگری ئەو سڵکردن و گومانەم، کە بیرۆکەی گەر هاتو ناجور و دزێووکریت بوو، واڕاسترە ڕاست دەرچێ، بەکردەییش ئەمە لەئاستی پرەنسیپی لۆجیکیانە دانانێم، تەنانەت گەر هۆیەکەش هەر هێندەبێ، کە ئادەمیزاد بیروڕای ئەوتۆبەدی ناکات، حاڵەتی ناکۆك و ناجوری لەنێوانیان بەبەردەوامی ئاڵوویر بکات و ناشکرێ هەر هەموویان لەهەمانکاتدا ڕاست دەربچن، بەڵام بەگشتی پێم وایە گریمانە بەدبینیەکە زێدەتر یا بەحیکمەتترە و ناشکرێ سروشتی ناجوری و دزێوی عەدەمیەت هەرگیزاو هەرگیز ڕێژەگەرایی لێکبترازێنێ، بەڵکە بەپێچەوانەوە، بەس تەنیا پتر هەڕەشەدارتری دەکات.

لەڕاستیدا بەهیچ ڕێگەیەك، شیمانەی ئەوەی گوایە ڕێژەگەرایی ڕاست و ڕەوا و دروستبێ، بەهاوێردە لەقەڵەم نادەم، ڕەنگە بەڕاستی لەکۆتاییدا نەکارین بەهای جێگیر دابمەزرێنین ئەو بەهایانەی هیدایەتداری ژیانن، سروشبەخشی مرۆن هەروا لابەلا و مەرجدار بمێننەوەو چ ڕێسایەکی دامەزرێنەرانەش جگە لە سیستەمگەلی بیرو سۆزی ڕێکخراوانەی بازنەیی، کە خودی خۆی دەسەلمێنێ و بەرۆشنبیرییەکان ناوی دەبەین، ناکرێ بینین و منیش پێشنیازی خۆتەرخانکردن ناکەم وەکو کەسێکی



توانادار بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو کێشە ترسناکە، بەڵام گەر ڕێژەگەریی ئەخلاقی ڕاست و دروست بێ، ئەوە ڕاست نییە بەو پێیەی دەرەنجامێکی سروشتی بونیاتنان و پتەوکردنی ڕێژەگەریی مەعریفی ئیدراکییە یاخود لکاوە بەیەکسانی مەعریفەیی لەنێوان شێوازەکانی بیردا، ئەو جۆرە یەکسانییانە باڵناکێشن، ڕاستیش ئەوەیە ئەو عەدەمیەتە (بەپێچەوانەی پێشبرییەکانی گیرتز) لۆجیکیانە لەو جۆرە ڕێژەییە بەرهەمدێت، دەشکرێ لێوەی بەرهەم بێ، هەر کەکۆڵەکەکانی ئەو ڕێژەگەرییە پتەوو قایم بوون.

بەڵام هەرچی پەیوەستە بەبارودۆخی ڕەگەزی مرۆیی لەم سەردەمەماندا ئەو زۆر بەتەواوەتی بەرچاوی دەخات، کە ڕێژەگەریی ئیدراکی مەعریفی قەڵپە - ساختە - قەڵپیشە چونکە بێشومار ڕاستیە کۆمەڵایەتیەکان ئەوە دەسەلمێنن، نەك لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی ئەنجامگیریی کارەساتئامێز کە ئەگەر ڕاست بوو (گەرچی لەواقیعدا دەبێتە هۆی ئەو جۆرە دەرەنجامە لۆجیکیانە) و ڕەنگە ڕاستیش بێت، بەڵام ئەمە ناکرێ بسەلمێنرێ بەپشت بەستن بە پێشەکییە لۆجیکییەکەی یەکسانێتی تەئویلی تێکڕای سیستەمەکانی بیر، چونکە هێشتا ئەو پێشەکیە لۆجیکیەی نەڕەخساوە بۆمان، هەر لەبەرئەوەشە نادروستە، قەڵپە.

کەواتە، لەوێدا بەڵگەی بەهێزی ئەوتۆ هەیە لەسیستەمێکی جیاواز هەمەکییانە ڕێژەگەریی مەعریفی پوچەڵ دەکاتەوە، یەکێکیان، ڕەنگە هەرە گرنگەکەیان بێت.خۆی لەوە دەنوێنێ ڕێژەگەرایی چارەیسەرێکی وێڵکەر و گومڕانییە، بەقەد ئەوەی بەشێوەیەکی تۆقێنەر سەمتێکی ناتەواوە سەبارەت بەگێروگرفتەکەمان، ئەو زۆربەسادەیی بەتەواوەتی لەوەسپکردنی حاڵەتە دەستە جەمعیەکەمان هەڵدەکات و کاتێکیش بە وەسپکارێکی تەنگانە و نیگەرانی و ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی ئەقڵی نوێ دەبنەوە دادەنرێت، ئەوە لەمەدا وێنەیەکی سەرتانسەری ناهەمواریە و گەلەکیش سەیر و سەمەرە و توندوڕۆییانەیە بەجۆرێك مەحاڵە لەمیاندا بتوانین مامڵە لەگەڵ ئەو کێشەمان بکەین.

ئەو حالەتە ئالۆزكاوییەی بەگشتی ڕووبەڕووی بیری نوێ و بەتایبەت ئەنترۆپۆلۆجیا دەبێتەوە، بەشێوەیەکی قووڵ بەبێ ڕیزبەندیی و یەکدیگیریی و هاوڕێژەییە. ڕێژەگەرایی ئەگەری ئەوەی دەخاتەوە یا دان دەنێ بەهەبوونی جیهانێکی ڕیزبەندو یەکدیگیرانە. ڕۆشنبیریی (ئەلیف) دیتنی تایبەت بەخودی ڕۆشنبیریی (بێ) هەیە، بەهەمان شێوەش (بێ) دیتنی تایبەت بەخودی خۆی و (ئەلیف) هەیە، هەمان شتیش لەسەر تێکڕای زنجیرە ڕۆشنبیرییەك پیادە دەکرێت، ڕۆشنبیریی (ئەلیف) نابێ حوکم لەسەر (بێ)بداو بەپێچەوانەش، ناشبێ (بێ) (ئەلیف)بەپێی مەرجە خودیەکانی خۆی ببینێت، پێویستە هەرکامێکیان فێرە دیتنی ئەویدیکە بێت بەپێی مەرجەکانی ئەوەی دی (گەر ئەویش وایکرد)، ئەمەش، بەشێوەی گریمانەیی، ئەرك و دەستکەوتێکی ئەنترۆپۆلۆجی تەئویلیە، هەروەك خودی خۆی مەزندەو وێنای دەکات، پێویستە تا ئاستێکی هەرە زۆر وەرگێڕێکی بێلایەن بێت، ئائەمەیە ئەو وێنەیەی ڕێژەگەرایی دەیخاتەڕوو لەزۆر حالەتدا تاکەکەسانی هەردوو ڕۆشنبیریی — ئەلف وبێ - دووچاری جۆرێ لەسێنترالیزمی عرقی — ڕەچەڵەك — دەبن، چون وا زەندەکەن، کە چەمکە تایبەتیەکانی ئەوانە، کە جیهان دەخاتە ژێر چنگی خۆی هەروەك لەهەقیقەتدایە و لەسەر ئەویدیکەیە خۆی و هەمووشتێ لەڕوانگەی خودی خۆیەوە ببینێ و نەفامییە گەر لەمەدا شکستی هێنا و لەم بۆچوونەشڕا، کاروئەرکی یەکەمی ئەنترۆپۆلۆجی تەئویلی بریتیە بەدەنگهاتنێکی بیسەرانەیی و چارەسەرکردنیان بۆ چاکبوونەوە لەو مەیلە سێنترالیزەی سەر - عرق - ڕەچەڵەك (لادێگەرایی توندخوازانە) و بەتوندی ڕەخنەلێگرتنیان بەو دەستەواژانەی بەهەڵەداچوونە بەهۆی ئەو خولیاو ئارەزووانە، ڕوونیشە ئەو دەگەڵ برێکی بێشومار لەچەشە و زیندەگێتی و شادمانی ئەمە ئەنجام دەدات و واش لە گوێگرانی دەکات بڕوا بکەن بەوەی تێگەیشتنی ڕۆشنبیریەکی نامۆ پرسێکی گرانە بەشێوەیەك ترسناکە و جۆرێکی تایبەتی لەبیرتیژی و لێزانی و دنیادیتەیی گەرەکە و بەتەواوەتیش مسۆگەرە ئەمە بۆ هەرچی قووت بۆوەو نەبۆوە



نەڕەخساوە، ئا ئەمەیە گوناهێکی فێرگەی تەئویلی، پێڕۆکارانی پۆست مۆدێرنیزم ڕیسواو لێوانلێو بەسەرمەستیەکی زەبەند، ملکەچینە، بۆ چێکردنی شێوازێکی قەشەنگی ئەدەبی بەحەماسەت و سەرمەستی جۆشیان بدات، بەهۆی گرانی ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی "ئەویدیکە" بەجۆرێك لەدووماهیدا تەنانەت هەوڵنادەن بیشیگەنێ، بەڵام بڕوا بەخۆدێنن و خۆرازی دەکەن بەشرۆڤەکردن و درێژداڕی حاڵەتێك کە گەیشتن پێی ئەستەم بێت بەجۆرێك لە تەلقینی مەعریفی نێو "دەمبەستی نادیار"و "سەرپشکایەتی نەگەیشتن" دەخەنەڕوو... مەحاڵی گەیشتن بە "ئەویدیکە"بۆتە جۆرێك لەزانست و نهێنی لوغزاوی سەربەخۆ.

بەڵام وێڕای توانستی یا مەحاڵبوونی گەیشتن بە "ئەویدیکە"، ئەوە گەردوونی وەهمی، کە ئەندێشەی ڕێژەگەرایی تەئویلی چنیویەتی لە ڕووی ریزبەندیی ویەکدیگیریی رێکە، ئەویش بەجۆرێك بەوگەردوونە کشاو و بەرفراوانەی فیزیاویان دەچێت، چون هەسارە دابڕاوەکان پاشەوپاش لێکدی دووردەکەنەوە و تێکڕای گەردوونیش وەك خۆی دیار دەدات لەهەر نوختەیەکی دیاریکراوی هەرە لەباری سوسەکردندا، کاری گرنگیش بەڕاستی لە نەبوونی نوختەیەکی هەرە لەباروگرنگ دایە، ئائەمە بوو ئایدیۆلۆجیای کۆلۆنیالیزم، بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە هەموو ڕۆشنبیریەکان یەکسانن و هیچ کامێکشیان بەگوێرەی گوزارش و مەرجە تایبەتیەکانی خۆی مافی حوکمدان لەسەر و ڕاڤەکردنی ئەوانیدی نیە، لەسەرووی هەموو شتێکەوەش (ترسی دوماهی) نابێت بانگەشەی ئەوە بکات، کە گەردوون بەهۆی گوزارشەکانی ئەوو بەپێی مەرجەکانی ئەوەیە دەبێت بەشێوەیەکی ڕاست وەسف دەکرێت، ئائەمەیە ڕیزبەندیەتی تۆقێنەر، کە وێنەیەکی قەڵپی کارەساتئامێز و تەواوی ئەو جیهانەی تیایا دەژین دەنوێنێ و هەرکێش پەسەندی بکات ناتوانێت تەنانەت بەلای فامکردن لەو حالەتە هەنووکەیەی مرۆ گەل نزیك ببێتەوە .

ئەو جیهانەی تیایداین بەتەواوەتی جیاوازە. دووریش نییە، بەرلە دووهەزار و پێنسەدساڵ بەجۆرێ بەو جیهانەبچێ، کە ڕێژەیخواز نیازی بووە بیکێشێ، بەلای

کەمی لەهەندێ لایەندا، فرەیی لەکۆمەڵگە خۆییەکاندا بەدیکراوە، هەریەکە و داب ونەریت و ڕێوڕەسم و ئەفسانەی خورافی خۆی هەبووە و بەڕاستی ناپەسەندیشە هەوڵبدرێ یەکێکیان بەسەر ئەوانیدیکە بسەپێنرێ و بەچاکتر بزانرێ، لەمەش زیاتر، والەقەڵەم بدرێ گوایە هەقیقەتی پەیوەست بەهەریەکێکیان دەکرێ تەنیا لەمیانەی زمانە زاراوەییەکەی ئەویدیکە بزانرێ ودرکی پێبکرێت .

وەك ئەو جۆرە نارێکی و ناڕیزبەندییە لایەندار و ناهەقەش شتێکی مەحاڵ و پڕوپووچە (وێڕای ئەوەی ئەستەمیشە مرۆ بیری گریکی بەدووربگرێ کاتێك لەو رووەوە هەنگاوبنێ لەمەڕ رۆنانی هەردوو زانستی ناسراو بە ڕاستی و گشتگیریی: لۆجیك و ئەندازە).

ئینجا سەردەمی -میحوەری - هات، هەروەك کارل یسبرز[٥٥] (١٨٨٣ - ١٩٦٩) پشتگیری کردو جارێکی دیکەش لەچوارچێوەی گفتوگۆ هەنووکەییەکە بەهۆی س.ن ئیزنشتادت[٥٦] خرایەوە ڕوو، ئەمەش مانای سەرهەڵدانی ژمارەیەکی دیاریکراوی رۆشنبیریەکان دەدات بەدەستەوە، کە لەدوووتوێی دا پەیوەندی نێوان خۆبەزلزانیی کۆمەڵایەتی تارادەیەك زێدەکرژ کەوتەوە، جیاکەرەوەی خۆبەزلگر خۆی لەهەرە پتر شێوەکانی گرفتاوی لەرووی پشت بەستن بە لایەنی کۆمەڵایەتی بەلایەنی کەم ئاشکراو ڕوون و بەرچاوانە، ڕزگارکرد، گوایە ئەو لەئامادەباشیدایە تاحوکمی بەسەربدات، ئینجا لەرێی پەیرەوکردنی دەسەڵاتێك، بەو دیو تخوبی هەر کۆمەڵگەیەکی خۆیی یا دەوڵەت یا گروپێکی ئیتنی، دەگات.

پرەنسیپ و ئاینزا و و بیروڕاکان و تیۆرەکە سەربەخۆییەکی زاتیان بەدەستهێنا، ئەمەش تەنیا کردەوە داوونەریتیەکانی نەگرتەوە، ئەوەی هاوزەمانە دەگەڵ ڕێوڕەسمە دیاریکراوەکان لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە، ماری ناڕێژەییخواز داخیلی بەهەشتی عەدەن بوو و جارێکی دیکەش جێی ناهێڵێ، سەرەڕای ئەوەی حاڵی ئێمە و جیهانەکەمانی گۆڕی، بمانەوێ و نەمانەوێ ئێمەین میراتگری (جاروباریش هەردوو بەیەکەوە) ئەو وەرچەرخانە کۆدێتاییە و هەقیقەتی زانستی سەربەخۆش لەڕووی



کۆمەڵایەتیەوە پێڕەوی ئەو دینە ڕزگاربووەی دەست جەستەی کۆمەڵایەتی کرد (ئەگەری ئەوەش هەیە ئەو وایلێکردبێ یا کردبێتی بەشتێکی شیاو) ئینجا، دوای دووهەزار ساڵ، شتێکی تۆقێنەر بەر لەچەند سەدەیەك لەو سەردەمەمان ڕوویدا.

بیرۆکەی یەکتایی و گەردوونگەرایی گشتگیریی ئەو هەقیقەتە هەڵقولاوە لەئیمانە بڕواداریيە تایبەتەکەی، بەڕاست یا هەڵە، دەستی داگرت بەسەر یەکێك لەو ڕۆشنبیریانەی ئەودیو سەردەمی -میحوەری - و لەو چوارچێوەیەشدا دواجار شێوەیەکی جیاواز، عەلمانی، نادینی، لەفۆرمێکی ئیدراکی مەعریفی سەریهەڵداوپەیدابوو، گەریش ماکس ڤیبەر و پەیرەوکارانیمان قبوڵ بوو، ئەوە ئەو شێوەیە گەلەك قەرزباری ئەو قۆناغە یەکخراو و ڕێکخراوەیەی پێشووە، دوای ئەوەی پێشینە لۆکاڵە ئاینیەکە کەشەکەی بۆ ڕەخساند و بەبێ ئەمیش هەرگیز نەدەهاتەئاراوە، خوداوەندیەتێکی تاکوتەرا، بەحەسادەت، جیاکار، بێوێنە لەڕێکخستنەکەیدا ئەو روئیایە بۆ جیهان دێنێتە بەرهەم، کە بەزمانێکی ئاینی، فۆڕمێکی جیاواز لە ریا بەر لە ئیدراکی ئەقلانی سروشت و مەعریفە، دەخاتەڕوو، بەڵکە ڕەنگە مەرجی پێشوەختەکەی پێویستیش بێت بۆ سەرهەڵدانی، ناچورالیزم — ئەقلانیەت - بەردەوامیەتی پەرستنی یەکتایی (یەکتاپەرستی- تەوحید) بوو، بەلاّم بەرێگە و هۆی دیکە، ئەو شێوە جیایەی عەلمانیەت، کە بەزانستی سروشت ناسرا، هەندێ لە هەرە سیفات و شوێنکەوتە بەرچاوو جیاو زەقەکانی بەخۆوە گرتبوو، بەم شێوەیە:

١- دەکرێ بە لەدەستدانی چالاکی و توانستی کارتێکەرانەی لەنێو هەر ڕۆشنبیریی و هەر وارێك، گریمانە و بانگەشەکانی تەرجەمە بکرێت.

٢- ئەو فۆرمە مەعریفیە توانی لەشێوازە پیادەکراوەکەی یا تەکنیکیەکەی، حاڵەتی کۆمەڵایەتی بەشەریی بەشێوەیەکی هەمەکی بگۆڕێت، سەرەڕای ئەو چوارچێوە مەرجەعیەی دەسەڵات، کە مرۆ لەژێر سایەیدا دەژین. بەرلەمە،کۆمەڵگەی کشتیاری مرۆیی لەجیهانێکی مالتۆسیانە ژیاوە، چون کەمیی

داهاتەکان بەگشتی خەڵکی ناچار کرد بچنە ژێرکێفی شێوازێکی بەرتەنگ و توندوتۆڵ و ستەمکارییە کۆمەڵایەتیەکان،و زاڵیەتی زۆرداران یا پسمامان یا هەردووکیان، هەروا گەردنکەچانە ملکەچی مەلەکیەتە ستەمکارەکان یا ئەو گرووپە خزمدارە فرە خواست و باوو سەپێنەراوانە لەڕووی داوونەریتەکانەوە، بوون کە بەزمانێکی خزموخوێشانە، لێی تێگەیینراون و بەهۆی گەیشتنی دەسبژێریانە کەشە - تقوس - کۆمەڵایەتیەکان پەسەندکراون، دەشکرێ ئەو دوو شێوازەی ملکەچکاری بەیەکەوە ئاوێتەبن، دەگمەنیی قووتبونەوەی کۆمەڵگەی چینایەتی مرۆیی، چون ئەو ئاست و پلە چینایەتیەی هەیانبوو، ئینجا، داهاتەکان لەژمارەی دانیشتوان زێدەتر بوون، بەمەش زاڵیەتی پتر ئارەزوومەندانەتر بوو لەوەی بەزۆری بێت و چیدیکەش پێویستی بەوەنەدەکرد کەسێ لەبرسانا بتلێتەوە، ڕاستە سیستەمی کۆمەڵایەتی هێشتا بنەڕەتییە ناکرێ دەستبەرداری ببیت، بەڵام چیدیکە ئیجباری نییە، ناچارکراو بەهۆی زەرورەتی گلدانەوەیان لە ئاپۆڕەی کۆمەڵایەتی چاوەڕوانکراو بۆ بەدەستهاتنی بنەما جەوهەریەکان، چیتریش پێویستی بە پشتڕاستکرنەوە نییە بەهۆی سندمکردنی خەڵکی لەو جێگە و ڕێگەیان لەنێو خودی ئەو ئاپۆڕەیەدا.

٣- ئەو مەعریفە تازەیەی ڕێخۆشکەرە بۆ سازبوونی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی تازە، لە ستراکتۆرە ڕێکخراوەییەکەیدا لە یەککاتدا هەم تەراکومی — و هەمیش نائیرادییە، هەروەها بە ڕێرەوێك یەکبەدواییەك بەخێرایی نەشونمادەکات و بەشێوەیەکی تاهەتایش دووبارە شون پێی هەنگاوەکانی ناکەوێت یا بە لەتبوونێکی هەرەمەکییانە یان بەرێکردن لەبازنەکان (هەروەك چۆن بەگشتی چارەنووسی گوتەکانی پێشتر وابوو پەیوەست بەتیۆریزەکردنی جیهان بێ).

پەیرەوکارانیشی تاڕادەیەکی سەرنجڕاکێش کۆکن بەو ڕێگەیەی تیایا بیروڕاکان بەهی چاکترئالۆوێر پێدەکەن. کۆك، بەبێ ناچارکردن و زۆرلێکردن، لەڕاستیدا ئەو یەکڕاییەیان لەوجۆرە، مرۆ شکی پیلانی لێدەکات، گەر ئەو ڕاستیە نەبێت، کە ئاماژە دەدا بەوەی ڕێککەوتن بەهۆی هەڕەشەوە نەسەپێنراوە و ئەوانیش ئەوەی



لێیان ڕەچاودەکرێ بەتەواوەتی بەرهەمیان هێناوە و ئەمەش شتێکە مسۆگەرە نادروستیشی مەحاڵە.

کەس نازانێ بەتەواوی چۆن ئەمە ڕوویدا و خاڵی بایەخداریش ئەوەیە زانست دەکرێ نا ئیرادی بێ، بەڵام فەلسەفەی زانست ئاوهانییە، زانایانیش بەگشتی لێکنزیك و کۆکن، وەلێ تیۆریزانان لێکدوور و جیان، بەڵام لێرەدا تۆزقاڵێ گومان نییە لەبارەی ڕوودانی ئەمەوە، تەنانەت گەر ئێمەش بەچۆنیەتی ڕوودانیمان نەزانی.

٤- ئەو مەعریفە تازەیە ڕێزنانێ نە لە ڕۆشنبیری نە لە فەزیلەی ئەخلاقی ئەو کۆمەڵگەیەی تیاسەریهەڵداوە یا ئەو کۆمەڵگایانەی ئازادانە تیایە جووڵە دەکەن و بڵاودەبنەوە، ئەو بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە و مسۆگەر لە "ئەودیوی چوارچێوەی ڕۆشنبیریی و فەزیلەی ئەخلاقی هەڵتروشکاوە" و بەداخەوە، ئەو لەزۆرجاردا نەك تەنیا -لەودیو -ە، بەڵکە دژیشە و یەکێکیش لەو سکاڵا تۆمەتبارانەی زێدە تاڵ و قووڵە لەڕووی هەست ونەستەوە دژی زانست و کە بەداخەوەش پاساوی خۆی هەیە ـ خۆی کتومت لەوە دەنوێنێ، کە فەزیلەی ئەخلاقی پەك دەخات.

ئەویش، هەروەك لەمەڕ مەعریفەی پێشتری نەشیاو (یا هەر ئەوەتا شیاو) لەڕووی تەکنەلۆجیاوە ڕوویدا. وەکو ئامرازێکی پەسەندکار بەکارنایەت، بۆ ڕێکسازی کۆمەڵایەتی و سیاسی و واش لەخەڵك بکات بەجۆرێ سەربەستانە لەجیهاندا هەڵسوکەوت بکەن و هەست بەدڵنیایی و ئاسودەیی بکەن تیایا، یا بەڕاستی بەتۆقێنراوی لێی بژین، لەوکاتەی سەرنجڕاکێشانە لە چاککردنی پڕۆسەی کۆنترۆڵکردنی نوشوست دێنن. کۆمەڵە بیروباوەڕەکانی پێشووو ڕابردوو — لەڕووی تەکنیکیەوە نەشیاو قەڵپ بوون و بەتەنیاش پرسەو دڵنەوایی لەڕووی ئەخلاقیەوە پێشکەش دەکەن.

زانست دژ بەهەموو ئەمانەیە، زانست سەرنجڕاکێشانە لە ئەداکردنی ئەو جۆرە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیانە نوشوستی هێنا، هەروەك چۆن لەهەوڵدان بۆ تەرخانکردن و ناچارکردنی بۆ ئەداکردنی، نوشوستیەکی بەتاوو سەختی هێنا (ساڵی

١٩٨٩ ساڵی دارمانی کۆتایی و دراماتیکی هەوڵدانێ بوو توندو زێدە خوازیارو پتر پتەوکارامەییانە) و نوشوستی خۆی لەبەرەواییکردنی هاوبەندییە کۆمەڵایەتیەکان دەبینێتەوە، هەروەها نوشوستی لەوەی وا لە خەڵك بکات هەست بە ئاسودەیی و ئارامی بکەن لەجیهاندا، زێدە باوترین — بەربڵاوترین - تۆمەتی ئاڕاستەکراو ڕووەو زانست و تۆمەتەکەش بەگشتی ڕاست و پاساودارە.

ئائەمەیە ئەو جیهانەی تیایا دەژین، لەجۆرەها هەلومەرج و بارودۆخدا و ببڕای ببڕیش چ بژاردەکمان لەوکارەدا لانییە، ئەو گرفتەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە کتومت لەو بنەما دیارو جیایانەی جیهانەکەمان سەرهەڵدەدات، کە ناکرێ لێی بەفرتوفێڵ بین یا لێی دووربکەوینەوە، خۆنیشاندانیش بەوەی ئێمە تاڕادەیەك لەجیهانێکی بەر لەزانستی دەژین، بەڵکە تەنانەت بەر لە میحوەریش، چونکە گشت کۆمەڵەکانی واتا یەکسانن، لەپێناو ئەوەی نێوەندی ئەمریکی کۆمەك بکرێ بەوەی ختوکەی هەست و نەستی دەدات و ڕۆچوون لەتقوسی تەکفیر لەزاڵیەتی بەکۆتاهاتووی فەوتاو، ئەو خۆ دەرخستنە هەڵبەستراوەش تەنیا ناماقوڵییەکی عەبەسییە و هەرچەندە خێراتر لەدەمکوتکردنی ئەو قسە پڕوپوچانەش هەنگاومان نا ئەوە هێندە باشترە.

لەواقیعدا، لایەنگرانی ڕێژەگەرایی (یا دژی دژەکە گەر گەرەکت بوو) کە گێرتز ئاماژەی پێدەدا بەگوزارشێکی سەرنجدار بۆ لادێگەرایی توندخوازانە کە نیازی رکابەرێتی کردنێتی، دادەنرێ.

رەهاگەرێتی لادێگەرایی توندخوازانە دوای ئەوەی لەناکاو هوشیار بۆوە، کە ڕۆشنبیریەکەی تاکوتەرا ڕۆشنبیریەکی نێو ڕۆشنبیریەکانە و سادەیش ڕەنگدانەوەی سروشتیانەی بەدیهیانەی سروشتی شتەکان نییە، ئەوە بیرۆکەی فرە روئیای سەرگەرم و سەرمەست کرد. بەو پێیەش بەدەست جۆرێ لە هەستکردن بەخەتا دەناڵێنێ بەوهۆیەی زێدە دەستڕۆیشتوو و هێزە لەچاو ئەوانیدیکە، ئەوە هەرچی هەیەتی لەنیەتپاکی و یەکسانیەتی "تەئویلی" ڕۆشنبیری دۆستانە، بەنکولێکردنی بەرپەرچدەرەوانەی زاڵیەتی لۆجیکیانە وێرای سیاسەت، دەبەستێتەوە. بەڵام کاتێ



ئەمە دەکات، بەهەقیقەت سێنتڕالیزە ڕەچەڵەکیەکەی پێشووی دووپات دەکاتەوە، بەڵام لەسەمتێکی تازە و نامۆ و لەمیانی تاسەو تامەزرۆیی بەجۆشوخرۆشانەی لێبوردەیی نەزانییەکەی پێشتری، فۆڕمێکی تازەی لێوە دەگرتەخۆ و ئەندێشە لێی باڵدەگرێ، ڕێکناسازی درامی و ڕەنگە تراجیدیش هی جیاو دیاری جیهانمان، توڕهەڵدات، ئەو جیهانەی تیایە دەژین دیاریکراوە بەرلەهەر شتێك بەهەبوونی سیستەمی مەعریفەی سروشت، بەتاکیایەتی و بێباری و هێز وەسپدەکرێ، بە پەیوەندییە داخوراویەکەی دیارو جیایە، بێبەش لەهاوئاوازی دەگەڵ کۆمەڵە بیروڕاکانی دیکە (ڕۆشنبیریەکان) کە خەڵکی بەگوێرەی ئەوەوە دەژین، ئەمەیە کێشەکەمان جگە لە "مۆدە" یەکی ڕێکوپێکی ساختە، هەڵبەستراو، جگە لە لادێگەرایی توندخوازانە لە دواسیغەکەی زێتر چیدیکە نییە، کە وا لە بیری ڕەسەنی هەقیقی دەکات، کارێکی مەحاڵ بێت، بەڵام ئەمانە بۆ ڕوویاندا؟ یەکێك لەشێوازە تایبەتییەکانی مەعریفە سەلماندی، کەخودان هێزێکی بێشومارە لەڕووی ئابوری و سەربازی و کارگێڕیی، بەجۆرێك لەسەرهەموو کۆمەڵگەکانە بەخۆوەی بگرێ و لەگەڵی ئاشت ببێتەوە، هەندێکیان زیاتر لەوەی دی سەرکەوت و هەندێکی دی ئەمەی بەزێدە ئارەزوو یا خێرایی لەویدیکە بەدەست هێنا، بەڵام لەسەر هەر هەموویانە ئەمە بکەن یا ڕووبەڕووی فەوتان ببنەوە، هەروەها هەندێکیش توانیان گەلەك یا کەمتر لەڕۆشنبیرییە پێشووەکەی بپارێزن .

خۆدانەدەست ئەو جۆرە نایەکدیگیرییە کە هەرگیز گفتوگۆ قبوڵ ناکات، کارێکە چ پەیوەندیەکی —هەرچیەك بێت - بەشکۆدارکردنی ڕەچەڵەکایەتی یا غەیری ئەو، هی هەر گروپێکی مرۆیی لەسەر حسابی هیدیکە، نییە، ئەو جگە لە شێوازێکی مەعریفە و پیادەکردنی چیدیکە نییە، هەروەها نەك هەر پۆلینکردنێکی تاکەکەسەکانە، بەو پێیەی رکابەری یەکدیگیریی و ڕیزبەندییە، ئەوشتەیە، کە هەڵدەبژێردرێت. دەبوایە ئەو شێوازەی مەعریفە هەڵبەت لەکات و شوێنی دەستنیشانکراو سەرهەڵبدات و تەنیاش تاڕادەیەك بەمسۆگەری پێوەندێتی

مێژوویی دەگەڵ کولتور یا ڕۆشنبیریەکی دیاریکراوی لەدەستدابوو، لەیەکێك لەو چوارچێوە کۆمەڵایەتیانە هەڵقولا، بەڵام ڕوونە، کە بۆ هەموو کۆمەڵگە مرۆییەکان دەستەبەرکراوە، وەلیّ هیچ کامێکیان پەسەند ناکات، کەچی واش پێدەچیّ وەکو بڵێی تارادەیەك بۆ هەندیّ توێژی مرۆ گەل زێتر لەوانیدیکە ڕەخساوە، ئەوەی کە بەشێوەیەکی هەرەمەکی لێی هەڵنەقولاوە و لەوێشدا پێویست بەگرێدانی مەزنترین پەیوەندییەکانی بنەچە و مەیل و خولیا هەڵبژاردراوەکانی ناکات دەگەڵ وڵاتی دایك، دووریش نییە پێوەی نەبەسترێنەوە، حاڵی حازر، ئومەی یەکەمی پیشەسازی و زانستی، چڵەپۆپەی ئیمتیازی پیشەسازی، لەدەست دا نییە چون وادیارە جاروبار وەکو بڵێی بێوچان هەوڵ دەدات لەشوێنی هەڵنیشتنەوە بگات بە پلەی دووەم، ئەمە لەیەککاتدا هەقیقەتێکی گرنگ و سەیرە، هەقیقەتێك زۆربەڕوونی و ئاشکرا لەمیانەی ساڵانی سەدەی بیستەم، قووت بۆوە.

کەواتە، ئەو مەرجانەی پاڵپشتی سەرهەڵدانی شێوازە مەعریفیەکەیان کرد، بەزەرورەت هەمان مەرجگەلیّ نەبوون، کە پشتیوانی گەشەکردنەکەی دواییان کرد: لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، ئەو دەستکەوتە پیشەسازییکارانەی لەو وڵاتانە بەدیهاتن، کە وڵاتی دایك بوون تارادەیەك کەمتر بوون لەوانەی لەو وڵاتانە بەدیهاتن، کە نوشوستیان لەنوێکردنەوەیان هێنا. هەرگیز ڕاستیش نییە، بە پێچەوانەی ئەمە ڕووبدات و ڕوونیش نییە کام هەلومەرجە ئەوەی دەورانەوری پەیدابوونی ئەو شێوازەی داوە ئەوە زۆر گرنگ وچارەنووسسازە؛ هەرکامێکیشیان بگری لابەلاوریککەوتانەو هەرەمەکیە، ئەگەری ئەوەش هەیە ئەو یەکلاکردنەوەیە بەیەکەوە لەکات و شوێنی دیکە، یەکدیگیر بن، بەڵام بەرلەهەرشتێك، بەتەواوەتی ڕوون بوویەوە، کە شێوەی بەهێزی مەعریفە لە ناڕێکوپێکی -نایەکدیگیریی- لە دایك بوو، کە ئیمتیازاتی باڵا دەست و تەنیا دابڕاونییە بەسەریەك دەستەی مرۆیی، بەمەش بەو مانایە نەبۆتە هۆی سازدانی هەر پۆلینکردنێکی ڕیزبەندیەتی دەستەمرۆییەکان .



ئەو ناڕیزبەندییە گەورەیە گەرشیا بڵێین دوو ڕەهەندی هەیە، لەلایەکەوە بەشێوازێکی مەعریفی تایبەتی ئەودیو میحوەری دادەنریّ، کە بەڕێگەیەك یا ئەویدی توانی بەسەر شێوازەکانی دیکە باڵادەست بێت و ئەمەش کاتیّ بەپێی پێوەری پڕاگماتیانەی چالاکیەکی تەکنیکی حوکمی لەسەر دەدریّ، سەرباری پێوەرەکانی دیکە وەکو دیقەت و درێژدادڕی سادە و قایم و پتەوی فراژیبوون بەشێوەیەکی بەردەوام و نائیرادیانە، لەلایەکی دیکەش فرەجۆری چالاکی و جموجۆڵە بەشەریەکانیان ڕەچاو کرد، بەڕاستی واپێدەچیّ ئەو هێزە مەزنە وەکو بڵێی لەهەندیّ کایەی دیاریکراو —وەکو زانستە سروشتیەکان و تەکنەلۆجیا کاربکات — بەڵام لەبوارەکانی دیکەدا، وەکو فامکردنی کۆمەڵگە و ڕۆشنبیری ئەوە پیادەکردنی بێشك بەرزترکرا لەو ئاستەی زانیاری و پێزانینمان، بەڵام هەر ئەوەتا شتیّ هەیە مرۆ هاندەدا بۆ قسەکردن لەسەر شۆڕشێکی درەخشاوە شۆڕشێك جوغزی ئەو دەسەڵاتە مەرجەعییە دەگۆڕێت، کە تیایدا دەژیت، ڕەنگە ئەمە هۆکارێك بیّ، کە خەڵکی بەرەو تەئویلیەت ڕاکێش دەکات.

ئەو بەڵێنی پێشکەشکردنی - تەئویلی تەفسیرانەیەی - ئەو نوشوستیە دەدات و دووریش نییە چارەیەکی گونجاوبیّ بۆی، یاخود جێگۆڕکیّ کردن بە خواست ومەبەستەکانی لەرووی پیادەکردنێکی هەمەکییانەی زانست بەسەر ئادەمیزاددا، بۆ/ یا لەمەڕ یەکێکی دیکەی سەرنجراکێشتر لەگەڵیا کەمتر دووچاری نائومێدی دەبێت. بەڵام ئەو نایەکدیگیرییە دوالیزمە بێشوومارە — جۆرێکە لەو مەعریفەیەی لەیەك بوار لەبوارەکانی ژیان و بەس کاردەکات، ئەگینا جۆرەکانی دیکەی کارناکەن (یاراستتر، بەهەمان ئەوکاریگەرییە کارناکەن) ، کە بەهەر حاڵ تائێستا — ئەو باکگراوندە دەخاتەڕوو، کە پێویستە بەپێی ئەو بژین و بیربکەینەوە، وەلیّ بنەمای ئەو ڕیزبەندییە تێکەڵ و پێکەڵ کراوە کە تەئویلییەت ئەمە ڕەتدەکاتەوە، بەمەش وادەکات هەر بیرێکی واقیعی مەحاڵ بێت.

ناکرێ مرۆ بەچاو داخستنی لەواقیع، بەشێوەیەکی ڕاست بیربکاتەوە، یەکسانیی تەئویلیش لەنێوان گشت کۆمەڵەکانی واتادا ڕێمان پێنادەن تەنانەت پرسیارێکیش - خۆ تاوانی وەڵام هەر هیچ —بکەین پەیوەست بەو هۆیەی، کە جیهان لەوپلەیەی نارێکوپێکی تیا هاتۆتە ئاراوە، ئەو ئارەزووە مکوڕە بێهیوایەش نەبووە بۆ گەیاندنی یەکجۆر سەرکەوتن لە مەعریفەی ئیدراکی و دژیەکیەتی لەنێوان ئەو بوارانەی سەرکەوتنی تیا بەدیهات و ئەوەی ونبوو لێی لەئارادانەبوو ڕەخنەگرتنی ڕاستەقینە و گەورە لەسەر ڕێژەگەرایی لەوەخۆی نانوێنێ کە چارەیەکی نادروست پێشنیاز دەکات (گەرچی واش دەکات)، بەڵام لە بەرئەوەی بەربەست دەخاتەوە تەنانەت لەدیتن و دارڕژتنی گیروگرفتەکەشمان.

حاڵەتێکی تەکینەوەی دژواری رکەدار و جاروباریش خوێنگەرمانەی هەڵایساو، لە ڕووبەڕووبونەوەی هەقیقەتی ناوەندی سەردەممان — پاساوی خۆی لەو بڕوبیانووەکارییە ڕواڵەتییانە دەبینتەوە، کەدەڵێ خەڵکی لەمیانەی مانا دەلالەتییە ڕۆشنبیریەکان دەژین و ئەمەش دووماهی و — خود ئیکتیفایە - لەبەرئەوە هەموو ڕۆشنبیریەکان لەڕووی مەعریفیەوە یەکسانن و بەمەش ڕەنگە لە هەقیقەتی ناوەندی سەردەمەکەمان هەڵنەقوولابن، گەریش بەڕاستی ئەمە کرابێ — ئەوە بەتەنیا یەکێ لەگوناهە سەرەکیەکانی ڕیزبەندییەتی تەئویلی دادەنرێت و دەنوێنێ، بەڵام تاکە گوناهیش نییە. گوناهە گرنگەکەی دیکە، لایەنگیریی هەمیشەیی بنجداکوتاوە لەم جۆرە بیروباوەڕە ڕووەو ئایدیالیزم، مەبەستیشم بەکەمگرتنی گرنگێتی پێوەندە زۆرەملەو ئابورییەکانی کۆمەڵگەیە، هەروەها بەهەندگرتنی گەورەکردنی بەهای بەربەستە چەمکایەتییەکانە، ئەویش کارێکی سەیرە، مادام تەئویلییەکان (بەهەر حاڵ لەجیهانی دوایساڵی ١٩٤٥) ڕووەو چەپ لایان کردەوە یا بەهەرحاڵ گەلەك بەرهەڵستکار و ڕەخنە لەڕژێمەکە دەگرن، ئەوەشیان لێ ڕەچاودەکرێ، بەدەست هەستەوەرییەکی لەڕادەبەدەر بناڵێنن ڕووەو شێوەکانی پێوەندی زۆرەملە و ئابووری و ئەو ڕێگەیەی کە ڕابەرانی کۆمەڵگە لەمیانەیدا ئامرازەکانی کارتێکردنی ئابوری



و دەسەڵات پاوان دەکەن، بەجۆرێك پێگەکانیان پتەوترەو پشتیوانی لێدەکەن و ڕەنگە ئەوەشیان لێ ڕەچاوبکرێ هوشیاربن لەئاست ئەو ڕێگەیەی بەهۆیەوە زۆرەملێتی سیاسی و ئابوری واتا دەلالەتییەکان دووپات دەکرێنەوە و دەسەپێنرێن، لەبری ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی یا تەنانەت -حەسریش - چاو بخرێتە سەر ئەو ڕێگەیەی واتاکانی تیا بەکاردێن بۆ بناخەڕێژی و پشتگیریکردنی نایەکسانی سیاسی و ئابوری، بەڵام وا پێدەچێ تەئویلییەکان گەلەك بایەخ نەدەن بەستراکتۆرە سیاسی و ئابوریەکان، زاڵیەتی هێماکان و گوتار، ئەمانەن بەڕاستی مایەی پەلکێشیی و زامنکردنی بایەخدانیانە.

ئەوان بەو ڕێگەیەی بەهۆیەوە چەمکەکان کارە سندمکراوە کۆتکراوەکەیان پیادە دەکەن، بەمە زۆر بەتوندی کارتێکراون و زۆریش گوێنادەن بەشێوە زۆرەملێیەکانی دیکە، کە ڕەنگە زێدە بایەخدارتربێت. لەبەرئەوە هەڵوێستەکەیان حەساسیەتێکی دەستبژێریانە دەردەدات لەواقیعدا ئەو کۆتانەی دیکە پشتگوێ دەخات، یا تەنانەت تارادەیەك دانیشی پیا نانێت .

گەریش ئێمە لەجیهانێکدا دەژین لەواتا دەلالەتیەکان و واتاکانیش جیهان لەناودەبەن، ئایا جێگەیەك هەیە بۆ ناچارکردنی زۆرەملێیانە بەبەکارخستنی قامچی، یادەمانچە یا برسیەتی؟ جیهانی دەوڵەمەندی ڕۆشنبیر، بەهەرچی لەهەمێزیەتی لە دڵنەوایی ئاسودەیی و گەرموگوڕی، ڕێی پێدرا تاوەکو ئەو جیهانە دڵڕەقە پروپوچەی لەدەرەوە هەڵتروشکاوە، بنوێنێ.

بەبێ مشتومڕیش، بەڕاستی چەمکەکان کۆت و پێوەندن، چەمکەکان و زنجیرەیەکی فراوان لەبیروباوەڕە ڕەخساوەکان و هەرچی هەر زمانێ (لغـە) ئاماژەی پێدەدات و هەرچی ناکرێ بەزمانی گوزارشتی لێبکات بەشێك لە دەزگای تەحەکومی کۆمەڵایەتی لەهەر کۆمەڵگەیەك دەنوێنێ، بەڵام ئەوەی هەر نادیارەو روون نییە، بریتیە لە مەودای گرنگێتی ئەو ڕۆڵەی کۆتبەندە چەمکایەتییەکان دەیگێڕن، کاتێ بەفشارە سیاسی یا ئابورییەکان بەراورد دەکرێن و لێرەشدا هۆیەك

نییە ئەگەری ئەوە بخاتەوە کە هەمان وەڵام بەسەر تێکڕای زەمانەکان و هەموو شوێنەکان پیادە دەبێت.

کارە ڕوونەکە ئەوەیە کۆتبەندی چەمکایەتی تاکە میکانیزم نییە کەلە کاردایە، کۆمەڵگەی ڕووسیایی، بۆنمونە، بەهۆی ڕووداوەکانی شۆڕش ١٩١٧ وەرچەرخانێکی بنەڕەتیانەی لە نێوان ساڵانی ١٩١٦ - ١٩١٨ بەخۆوە بینی، هەروەها کۆمەڵگەی ئەڵمانی بەهۆی شکستی ساڵی ١٩٤٥ لەنێوان ساڵانی ١٩٤٤- ١٩٤٦ هێزی دەسەڵاتگر پێگەکان ئاڵوێردە دەکەن، شوناسی ئەوانەی توانای کوشتنیان هەیە و ئەوانەی بەرهەڵستکاری دڕندایەتیەکەن، بەشێوەیەکی بنەڕەتی جێگۆڕکێ دەکات. بەڵام لەوێدا چ هۆیەك نییە وامان لێبکات ئەگەری ئەوە بخەینەوە، کە ڕەنگە جیهانی چەمکایەتی ناوەکی هاووڵاتی ئاسایی ڕووسیایی یا ئەڵمانی، بشێت تا ئەو پلەیە یا بەو پەلەیە لەمیانەی هەمان ماوەدا گۆڕاوبێت، ڕەنگە لەژێر کاریگەری ڕووداوەکان کەمێك گۆڕابێ، بەڵام سەبارەت بە زۆربەی زۆری خەڵکی وانییە، کە دووچاری گۆڕانێکی قووڵ بووبن، ئەستەمە بەو خێراییەش بیروباوەڕیان بگۆڕن، بەڵام کۆمەڵگە بەر لەهەرشتێك هەیکەلە دەسەڵاتگیرییەکەی دووچاری گۆڕینێکی هەمەکیانە دەبێت و ڕوونیشە ئەو وەرچەرخانە قوڵانە لەستراکتۆرە دەسەڵاتگەرییەکاندا ناکرێ بخرێنە پاڵ گۆڕانکاری سەرەکی (بەزۆری) و سەرەتایی و کاتیی لەکۆمەڵەی واتادا، هەروەها بەروونی دیارە خودی ئەو گۆڕانکارییە دراماتیکیانە - دەرهاویشتەی - وەرچەرخانێکە لەئامرازە مایەکییە بەزێنەرەکان لەدەستی کۆمەڵە تاکە کەسێك بۆ هیدیکە، لەئەنجامی شۆڕش لەحاڵەتی یەکەم و شەڕێکی دۆڕاویش لەدووەمدا، نەك بەهۆی هەندێ وەرچەرخانی سیمانتیکی (لەوتەو واتاکانیاندا)، گرنگ کێ دەمانچەی پێبوو و کێش چی پێنەبوو و گریمانەی پێچەوانەش واتە ڕۆچوون لەفۆڕمێکی ناماقوڵانەی عەبەسی لەئایدیالیزم، بەتەنیا سەمتی نامێژوویی ئەبستراکتی بنەما تەئویلی، ئەوە، کە ناماقوڵیی تەواو و نەیاری بۆ لۆجیکی شتەکان، پەنهان دەکات، دەشارێتەوە.



تەئویلیەکان، بەهێمنی دەخزن بۆ دوورکەوتنەوە لەئیدراکی تەواو ڕاست بۆ ئەو هەقیقەتەی، کەبەڕاستی چەمکەکان کۆتبەند دەکرێن و پەنابردنە بەربنەمایەکی ئایدیالی، کە ببڕای ببڕ بەرگری لێناکرێ، یاڕاستتر گریمانەی ئامادە بۆکارکردن، دەشڵێت بەتەنیا چەمکەکان تەگەرە نین. لەبەرچی؟ ئایا هۆیەکەی غروری هزرڤان و دڵشادییەکەیەتی بۆ بیرکردنەوەی بەوەی ئامرازە تایبەتەکانی، واتە بۆ نمونە بیروڕاکانی ئەوە، کە بەکردەنی دەستڕۆیشتووە بەسەر سیستەمی کۆمەڵایەتی، نموونەی ڕەوتاری مێژوو ئاڕاستە دەکات؟ هەمیشە گومان ئێخەی دەگرتم، کە ئەمە یەکێکە لەڕەگەکانی ئایدیالیستی سۆسیۆلۆجیایی هەر دەستپێك لەهیگڵەوە بەرە و ژوور هەڵکشا. یاخود ئایا ئەو هەقیقەتەیە ئاماژە دەدا بەوەی تارادەیەکی دوور گەیشتن بە ستراکتۆرەکانی چەمکایەتی ساناترە، نەخاسمە لەقۆناغی پۆست کۆلۆنیالیزم؟ جیاکاریە گەورەکە لەوەدایە، کە حاڵەتی کۆمەڵایەتی کتومت لەڕاستی دەرهاویشتەی ناڕێکسازیە لەدەسەڵاتی ئیدراکی مەعریفی، لێکترازانی کۆمەڵگە تەقلیدیەکان و ئاوێتەبوونی ڕەگەزە ڕۆشنبیرییە باوەکان (کە گیرتز کاتێ توانجی گرت لەو حاڵەتە تێکچڕژاوەی ڕووبەڕووی ئەنترۆپۆلۆجیا هاوچەرخەکان دەبێتەوە، سەرنجیدا) و ئەمانەش واپێدەچن وەکو بڵێی هەندێ ئەنترۆپۆلۆجیان ڕووە و حاڵەتی مگێزی"تەئویلی" تەکان پێدەدات، ستراکتۆرە کۆمەڵایەتیەکان لەپلەیەکی ئەوتۆی ئاڵۆزی و تێکچڕژاندانە بەجۆرێك زۆر ئەستەمە تێی بگەی، بەڵام ئەمە مانای ئەوەنییە بوونی نییە، یا نەبوونی توانستی - پوختەکاری - بۆئاستی کۆمەڵەکانی واتادا.

هەروەها ئەمە بەمانای نەبوونی ستراکتۆری مایەکی بابەتیانە یا بێبایەخی نییە، لەزۆر حاڵەتدا دەوڵەت لە قۆناغی پۆست کۆلۆنیالیزم دەوڵەتێکی ئایدیۆلۆجی بووە، دەربەست بەبانگەشە عەبەسیە پەیوستدارەکانی بەخودی کۆمەڵگەی — ئیدی دەمارگیری هۆزی -تیرەگەری - لەناوبرا و دژایەتی چینایەتیش بوونی نەما، هەروەها کەمینە جوداخوازەکانیش، دوای ئەوەی بەوە ڕازی بوون لەنێو کۆمەڵەی

زاڵ و دەستڕۆیشتوودا بژین، بەڵام بەرپرسی ناوچە (هەرێم) تازەکە بەڕاستی هەست بەئارامی ناکات، چونکە کارێکی وردو هەستیار ئەنجام دەدات بەهاوسەنگی کردن لەنێوان فشارە خۆماڵیەکان لەلایەك و لەلایەکی دیکەش ئەو پیلانانەی بونیاتنانی ڕیزبەندایەتی، کە ئینتیمای بۆ هەیە و ئەندامێتیشی تەواوکاری سیفەتە مەزنەکانیەتی بەجۆرێك وای لێدەکات بەهەر نرخێك بێت بەتاسەوپڕبەدڵ بیپارێزێ و دواشتیش کە بەهیوایە بۆی هەبوونی لێکۆڵەرێکی بیانی لوتی لەناوچەکەی هەڵقورتێنێ و تێوەبگلێ و دەسەڵاتیشی لەمیانی سەربەخۆییە بەغەڵبە و بەرچاوەکەی لێی لاواز بکات — چون ناکرێ ڕێ لە گەڕانەوەی بۆ کۆمەڵگە ڕەسەنەکەی و سەردانی هەر کێیەك بگیرێت— و بەمەش بەرپرسەکە دەخاتە هەڵوێستێکی ترسناکەوەکاتێك دواجارجاڕی ئەوەدەدا کە تیرەگەری باوو بەربڵاوە و جیاوازی چینایەتی بێشومارە و دەکرێ هەست بەتیژوتوندییەکەی بکرێ و کەمینە ئیتنیەکانیش تورەو نارازین و جا لەبەرئەوەی ڕێی پێنەدراوە هەموو ئەمانە بسەلمێنێ و ڕایبگەیەنێ ئەوە کۆسپە سەختەکان لەڕێگەی دادەنرێن.

کەواتە ئەو لێکۆڵەرەی کۆسپ و تەگەرەی خستەبەردەمی، لێبوردووانە یا بەختەوەرانە بەپێی حاڵەتی مەبەستدار، بەڵام بێوەی ئەلتەرناتیڤی هەبێت، وەردەچەرخێ بۆ کۆمەڵەی واتاکان، کە دەکرێ بۆخۆی کۆبکاتەوە و ڕێکی بخات (نەخاسمە گەر زۆربەی کتێبەکای لەو بیروباوەڕاانە پێکهاتبوو پەیوەست بەمەودای گەورە ئاستەنگیێ، کە ڕووبەڕووی دەربڕین و فامکردنی ئەوبیروڕایانەی بۆتەوە یا گواستنەوەی جارێکی دیکە دوای ئەوەی بەدەستی کەوتوون، هەروەها ئەو رادەیەی قووڵیی خەم وژان و ژووری، کاتێ کە بەرگری تاڵاوی ئەوحاڵەتە دەگرێت) لەبەدحاڵدا، چاوخستنە سەر موخبیرێکی (هەواڵنێر) تایبەت هەڵدەبژێرێ، لەوانەیە بیباتە شوێنێك دەستی ئەفسەری ناوچەکەی نەگاتێ، لێرەدا تیۆرێکی کۆن هەیە بەگشتی ئاماژە دەدا بەوەی، کە ئەنترۆپۆلۆجیای ئەمریکایی ئاڕاستەیەکی ڕووناکبیرانەیە، چونکە ئەرك و گرنگیەکانی لەتۆمارکردنی ڕۆشنبیری هیندە



سورەکان سەرچاوەی گرتووە و ستراکتۆری سیاسی ئەمانەش بەهەرحاڵ بەخت زۆریاوەری نەبووە، لەکاتێکدا ئەنترپۆلۆجی بەریتانیایی یا فەرەنسایی کۆمەڵایەتیخواز بووە، چونکە هەردووکیان لەو ئیمپراتۆریایە کاریان کردووە لەدەڤەر و هەرێمە بەربڵاوەکانیدا حوکمێکی ناڕاستەوخۆ بڵاودەکاتەوە، چون بونیاتە خۆماڵیەکان زۆر گرنگ و بایەخدارن. حوکمی ناڕاستەوخۆ واتە بێبەشکردنی راجا یا میری خۆماڵی لەهەندێ دەسەڵاتیدا، بەڵام هازەمان هانی زیاترکردن و تەئکیدکردن و دەرخستنی شکۆیی و داوونەریتەکەی دەدات، ئینجا ئەو ستراکتۆرە رەگداکوتاوە لەڕووی داوونەریتەوە زێدە ڕوون و بەرچاوبێت، گەریش کارەکە ئاوهایە، ئەوە دەرکەوتنی داگیرکار بەمسۆگەری تای جەزبەی تەرازووەکەی بەلای ڕۆشنبیریی دژ بەکۆمەڵایەتی شکاندەوە، لەمیانەی شاردنەوەی ئەو لایەنەی دوایی(کۆمەڵایەتیەکە) و کاری بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە تیایە بە پڕۆسەیەکی مەترسیدار لەقەڵەم بدات، لەبەرئەوەی بەکردەیی پێوەندێك هەیە دەرکەوتنی هەڵکشاوەی کۆلۆنیالیزم بەوەرچەرخانە تەئویلیەکەی دەبەستێتەوە، وێڕای ئەوەی کتومت ئەو پەیوەستیەنیە، کە ئادەتی دەهێنرێتەوە یاد.

ڕەنگە میتۆدیزم - مەنهەجیەت - هۆکارێکی دیکەی گرنگ بێت لەو بوارەدا، تەئویلیەکان ئامرازێکیان دروست کرد، کە لەسەریانە بەکاری بخەن، بەبێ ئەوەی گرنگی و بایەخی و بەچ ئامرازگەلی رکابەر بدەن یا بنەڕەتی یا بە پێویستی دابنێن، چوون بەتەنیا تەفسیری تەئویلی لەقەرەی دایە کۆمەڵەکانی واتا بگرتە دەست و بەتەواوەتیش تێیان بگات، بەڵام بەشێوەیەکی سانایی، بەتەنیا ناتوانێ لە ستراکتۆری ئۆبژێکتیڤانەی سیاسی، یا ئابوری یا هیدیکە تێبگات، لەوانەیشە هەمان کۆمەڵەی واتاکان گونجاوبن دەگەڵ هەر ژمارەیەك لەستراکتۆری دەسەڵات یا هێز یا سامان، بەڵام هیچ کامیان ناتوانێ لەحاڵەتی ئیشپێکردنی کردەیی خەبەردارت بکاتەوە، لەپێناوی ئەمانەدا و لەگەرمەی گرنگیدانی بەبڵاوکردنەوەی ئامرازە هەرە چاکەکەی یا ڕاستتر ئەوەی بەڕاستی بیوێنەیە، ئیدی تەئویلیخواز لەکاتی پراکتیزەکردندا لە گرنگی ئەو توخمانەی

دیکە ناچەمکایەتی کەمدەکاتەوە و جەخت دەکاتەوە سەرئەوەی، کە تەنیا ئاسەوارێکە یابەرهەمی سنعەتێك یا ڕەنگدانەوەی ئەو توخمە چەمکایەتییانەیە، بەبێ ئەوەی چ هەبوونێکی سەربەخۆی ڕاستەقینەی هەبێت، وەکی دی، هەڵوێستێکی ئایدیالییانە دەگرتەخۆ، وێڕای ئەوەی گوزارش کردن لێی بەزمانێکی زاراوەیی سیمانتیکیانەی پۆست مۆدێرنکاری ئەنجام دەدرێ، تەئویلییەت ناوە نوێیەکەی ئایدیالیزمە.

ئەو هەموو گوناهە و خەتایانەی بابەس بێ، بەڵام دەکرێ زێتر لەمەی بخەیتە سەر، کە هەڵوێستی بانگەشەکاری تەئویلی وێڕای ئەوەی داخوا لەشێوازە پێشوەختەکەی و میانڕۆیەکەیەتی لەڕووی ڕێژەییەوە یاخود لەشێوە "پۆست مۆدێرنیزمیەکەی" زێدە توندڕۆکەی لەحەساسیەتی ئەوانەی ئەو هەڵوێستە دەخەنە نێو جەرگەی گرفتە ناوەندەکەی سەردەمەکەمان کەمدەکاتەوە و بڕیاری پێشوەختە فرەجۆر بەسەر کێشە واقیعیەکانی نێو خودی خۆی دەردەکات: ئەویش، لایەنگران و پسپۆڕانی دەبوغزێنێ بەهۆی خستنەڕووی وەسپکاری سیستەمی کۆمەڵایەتی، کە بێبەشە لەهەر بەڵگەیەکی یەکترگر بۆ ئەوجۆرە ئەنجامە و بەتوندیش ڕێکردن بەسەر ڕێگەی تەفسیری ئایدیالیستی تەئویلی شەکەتی دەکات، بەڵام سەما و ستران لەکۆتاییدا لەسەر ئاوازی زاڵییەتی سیمبۆلیزم حەتمەن دەبنە هۆی پەنیکردنی هەقیقەتی شێوەکانی دیکە، وە ڕەنگە زێدەگرنگیش، لەناچاری و زۆرەملێیەتیدا.

لەوێدا بەجۆری تۆمەتێکی دیکە و ڕووخێنەر هەیە کە ئاڕاستەی هەردوو تەرزی پۆست مۆدێرنیزمی و "تەفسیری" دەکرێ، وێڕای هەمە میحوەری پاڵ "واتا" و هەموو ئەو ژاوەژاوە و هەڵڵایەی دەورانـدەوری ، ئەوە شێوازی ئەنجامگیری لەڕاستی، تێگەیشتنمان بۆ سروشت و ڕۆڵی واتا لەژیاندا پەسەند ناکات، بەڵام، ئەگەر هەر جیاوازیەکیش هەبێت ئەو دەیوەستێنێ و بەربەستی بۆ دەخاتەوە، هەڵبەت "واتا" شتێکی ئەستەمە لەڕووی ئەنجامگیری و لێکۆڵینەوە، ئەو تا ئەوپەڕی باووبڵاوە و هەر بابەتێکیش یا حەرفی هەر شتێ، پێویستە پێناس و دیاربکرێت و تەنانەت بەرلە بیرکردنەوەش لێی، جیاو دیارترین بن، بەڵام کە تایبەتمەندێتی دیارو جیا بخەیتە پاڵ



هەرشتێ ئەوە واتە "واتاکانت" بڵاوبکەیتەوە، واتا هەر لەسەرەتاوە، دەستپێك، هەیە و ئامادەیە بۆ هەڵنوتانمان و دەرخستنی - بازنەیی - هەر کار ڕاییەك، کە دەیگرینەخۆ.

بەڵام وێڕای ئەو جۆرە ئاستەنگانە، لێرەدا پرسیارگەل هەن دەبێ بخرێنەڕوو و تۆژینەوەش پێویستە ئەنجام بدرێت، وەلێ ئەنترۆپۆلۆجیای "تەفسیری" بەشێوەیەکی سەیر مەیلداری وەرگرتنی بیرۆکەی سروشتی واتایە وەکو بابەتێکی بەڵگەنەویست، یا وەك دەخرێتە ڕوو، دووماهیە، بەڵام ئەو گەشەکردنە زێدە سەرکێشیەی بەسەر ئەو خولیایە داهات، ئەوە بیرۆکەی واتا وەکو بەشێك لەو تەکنیکەی دەوروژێنێ و دەشڵەژێنێ و دەیکەیلێنێ، بەکاردەخات، زێتر لەوەی خاڵی دەستپێکی بیرێکی جیددی بێت.

چەند پرسیارێکی گرنگ هەن لە ڕووی لێکۆڵینەوەگەلی هێماکانی واتا، پەیوەست بەوەی کام لەواتاکانی تایبەتمەندییەکی ڕۆشنبیریی هەیە و کامیشیان، دەهەمبەر، تخوبە ڕۆشنبیرییەکە دەسمێت و ئەمەش بەپێی ئەو پێوەرانەی پێویستن، بۆبناغە داڕژتنی ئەمە یا هیدیکە، هەروەها لێرەدا جێگەورێگەی - گرامەری - بەرهەمهێنی واتاش هەیە، ئەو واتایانەی ئیجبارین چین و لەبەرچیش؟ ئەی ئارەزوومەندانە چیە؟ ئەمە کێشەگەلی سەخت و پەلبەستکراون، بەڵام بێسودە مەزندەکردنی جۆرێ لە تێگەیشتن یا بیرڕۆشنی لەوەی پەیوەستە بەو گرفتانە کاتێ وادیاردەدات وەکو بڵێی مەبەست لەو دەقەی مرۆ مامڵەی لەگەڵدا دەکات ئەوەبێ کە خوێنەر دانەری بیپێکێ وەك دیارە — بەنۆبە جۆشدانێ لەوروژاندن و پەژمردەیی و شپرزەیی، سەرەڕای زێتر لە لەمەسەیەك لە هەستکردن بەگوناه لەبارەی هەقیقەتی پێوەستبوونی ڕوونیی و تاکیایەتی واتا و کۆشش بەرەو ئۆبژێکتیڤیزم لەسەردەمی پێشوو و ئێستادا، بەزاڵیەتی سیاسی یا سەرکوتکردنی ئافرەت... ئینجا هەرچەندی بکەین و بکۆشین بۆ شێردنەوەی ئەوە جیاکاری نێوان خود — بابەت لەنوسیندا سەری هەڵدایەوە، بەمەش بەردەوام دەکرێ پرسەکە بەدڵارامییەکی هەستکردن بەگوناه بەکۆتا بێنین.

بەم هەموو قسانە هەڵبەت مەبەست لێیان نکۆڵیکردن نییە لەو پێشەکیە بنەڕەتییە لۆجیکیانەی، کە تێکڕای هەڵوێستەکەی لێوە دەستپێدەکات (بەهۆی

زێدەڕەوییەك لەگەڵ ڕێساكانی ڕەخنە كۆك نییە) و بە مسۆگەریش ڕاستە لەبەرئەوەی :
واتا باوەكانی لەهەر ڕۆشنبیریەكی دیاریكراودا بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ و سانا هەرهەموویان قابیلی تەرجەمەكردن نین بەو هۆیەی زۆرینەن لە ڕۆشنبیری دیكە و جاروباریش بیرای بیر ناكرێ تەرجەمە بكرێ، ئەگەرێ هەیە لەرووی دیاریكردنی ئەو واتایانەی پێشوەختە بێئاگا و نابەڵەدن بەو ڕەوتارە، دیاریكردنی واتاكانیش ڕۆڵێكی گرنگ، بەڵام فرەجۆر دەگێڕن (وەلێ ئەو مەودایەی ئەو ڕۆڵە دەیگاتێ نابێ پێشوەختە بەر لەتۆژینەوە و تاوتۆكردنێكی سنوردارانە بڕیاری لەسەر بدەین) لە پاراستنی ئەو سیستەمە كۆمەڵایەتیەی مەبەستە، هەموو ئەمانە ڕاستن، گەرچی بەتەواوەتی ڕاهێنانێكی ئۆرگیناڵ ناگرنەخۆ، ئەنترۆپۆلۆجیەكان تەكنیكی (تەفسیریی) یان پێڕەوكرد كاتێ پەخشانێكی مەحەك ئامێزیان نوسی: پەخشانەكەیان خودی خۆیان بوو و بەتەواوەتیش وەكو ئەو گۆڕانییەیان دانەهێناوە تاكو سەمای لەتەكدا بكەن، خودی گیرتز شایەتی بەدەقەكانی ئیڤانز — بریچارد هێناوەتەوە، كەگاڵتەی بە ڕوونیە ئاشكراكەی هاتووە، وای دەرخست كە ئەو ئیدراكی چەمكە خۆماڵیەكان و تێگەیشتنی كۆمەڵگە هاوشێوەووەكویەك لێدەكات[٥٧] كەواتە چی نوێ هەیە لەو كارەدا؟ .

گوتاری گیرتز پێچەوانەی دژە ڕێژەیی بەكەم لەمەترسیەكانی دەڕوانی، بەڵام گیرتز بەداخەوە، مرۆ ئاوا جیدێلێ، كە بۆچونێكی بەهێزی هەیە بەوەی كە بەسانایی لەدیتنی گرفتەكە نوشوستی هێنا و ئەمەش بەپێچەوانەی بانگەشەكانیەتی بەوەی گوایە دركی بە مەرامەكانی مەترسیەكی نادروست كردووە و دەمامكی لەسەر ڕووی ئەژدیهایەك لە كاغەز هەڵماڵیوە، گەریش مەعریفە و فەزیلەی ئەخلاق بەبێویستی خۆیان سنورداربن بەرۆشنبیریی یا ڕەگاژۆبن تیایا، ئەوە لەحاڵەتی تاوەری بابل، چی ڕوودەدات كاتێ ڕۆشنبیریەكان لەگۆڕانكاریەكی بەردەوام ئاوێتەكردنێكی توندن، بەجۆرێ مرۆ ناتوانێ ئەوە دەست نیشان بكات یەكەم لە كوێ دەست پێدەكات و لەكوێش دووەم بەكۆتا دێت (ئەمەش ئالۆزكاریەكە كەخودی خۆی لەڕەوتاری دیكە پێی لەسەر دادەگرت)؟ گەریش كارەكان ئاوا لاردەبنەوە (ئەمیش بەڕاستی وادەكات) بەبێ دەست بەرداربوون لە



پەناگەی ئارام لەدەرەوەی جوغزی ڕۆشنبیریەوە، ئەوە تاكە ئەلتەرناتیڤیی بەجێماو، ڕێژەگەریەتێكی نائومێدو زگارە، بەهەر حاڵ ڕەنگە بەڕاستی كارەكە ئاوابێت لەهەندێ بوارو كایەدا، بەڵام بێهودەیە بانگەشەكردن لەمەڕ ئەوەی، كە ئەمە گرفتێكی تێهەڵكێش نییە، بەڵكە تەنیا چپەچپێكی نیگەران و خۆهاندەرانەیە.

پێویستە چاودێرە دەرەكیەكە هەقیقەتی بوونی ڕۆشنبیریەكی نامۆی بیانی — یا تەنانەت تەك لاوەكی — خودان مانای تێنەگەیشتراو بگرتەخۆ بەر لەوەی بتوانێ "تێی بگات" ئەمەش بەكارێكی بەدیهی دیاروناسراو و باو دادەنرێت و لێرەشدا شتی نوێ لەئارادانییە لەوەی گەر ئەوجۆرە ئەنجامگیریە "تەفسیریە" چووە پاڵ چاودێرایەتی ستراكتۆری تێهەڵكێشانەی گشتی لەڕووی ڕۆشنبیریەوە (زۆرەملێیی، پشتگیریی) ئەوەی ڕەوتی ڕەسەنایەتی داهێنەرانە دەبەخشێتە ئەنترۆپۆلۆجیای تەفسیری بریتیە لەئاماژەدان بەوەی ئەو تەفسیرە تەئویلییە هەرچی بمانەوێ بیكەین دەنوێنێ، یا بەهەرحاڵ ئەو زۆر زۆر پرسی میحوەری بەرجەستە دەكات، لەو سەمتە زێدەگۆییە هستریاییەی وەریدەگرێ كاتێ دەبێ بە ((نوێخوازی لەمەو دوایی)) بۆ جۆرێك لە شاڵاویی دڕندانە لنگەوقووچ دەبێتەوە ، كە بە ڕاوەدوونانی جوداخوازن دەچێت یا دەركردنی ڕۆحی بەد — نەگریس - بە هۆی جادو و تەلیسم و نوشتی بۆ پاكسازی و سڕینەوەی هەر ئاسەوارێك ، كە كاری چاودێریی دەیخاتەوە لە میانی بانگەشە ڕواڵەتیانەكە بۆ بابەتگەرێتی ، دەخاڵەت دەكات یا زاڵ دەبێ، بەڵكو پرۆسەی جەڵد و سەرزەنشتی خود دەبێتە كارێكی وروژێنەرانەتر بەهۆی دانپیانان بە دوانوشوستی دەگەڵ ئەوەی لێی دەكەوێتەوە لە هەستونەستی شادیی و بەختەوەریی.

یا / یاخود (اما / أو): یا ئەوەتا هەقیقەتی بابەتی هەن سەرەڕای ڕاڤە كردنی واتا ڕووندەكاتەوە ، یاخود نەخێر. گەر بینرا ، نوێگەریی داهێنەرانە لە كوێدایە؟ ئەوە تەنیا لە ڕووی فۆرماڵیزەوە دەكەوێتە دەست ، بەڵام گەر بانگەشەیش كرا بۆ نەبوونی هەقیقەتی بابەتییانە، ئەوە بێ سێ و دوو خستنە ڕوویەكی قەڵپ ونادروستانەیە. چون ناتوانی بە دوای مانا تایبەتەكان دا بچیت بە بێ ئەوەی لە نێو چوارچێوەی سروشتی

دانەنێی، هەروەك لە روانگەی ڕۆشنبیرییە زانستییەکەمانەوە دەبینرێت، نەخاسمە لە سیاقی حاڵەتەکانی نایەکسانی لەرووی هێزی ڕستێکی هەمە جۆر لە فۆرمە مەعریفییەکان و هەست و نەستی ئەو هێزەی لێوەی دێتەئاراوە، سەیریەکە لەوەدایە، ئەوانەی لە دەرکەوتن و هەڵکشانی کۆلۆنیالیزم رۆڵیان هەیە، دوای کار لەکار ترازان ئیدی لە ئاکامی حاڵەتی نەبوونی یەکسانی لە هێزدا دووچاری هەستەوەرییەکی سەرسەخت ودژوار دەبنەوە، وا پێدەچێ وەکو بڵێی حەساسیەتیان لە ئاست ئەوەی زێدە گرنگترە لێی —لەو شتە- لە دەستدابێ.

لە پراکتیزەکردندا، ئەوانەی مەیلداری پەنهانی و بەلوغز کردنی کێشەی ڕۆڵی ڕێژەگەرایین، کە واتا و هەقیقەتە دەرەکییەکان دەیگێڕن، بۆ نمونە، تەکاندانە پەلامارە سەرەکیەکە لە کتێبی گیرتز نیگارا (Negara) لەوە خۆی نواند، کە دەوڵەتی بالی شانۆیەکی گوێزەرەوەی واتاکانە بۆ ئامادە بووانی تەماشاکەران و بینەران، بەمەش ناکرێ ئەمەو جۆرێکی دیکە لەو دەوڵەتەی بە زۆر باج لە هاوڵاتیانی دەسەنێ، ئاوێتە بکرێن یا هاوشێوە بن، ئەمەیە ئەو خاڵەی بیانوگەرایەتی هەمیشەیی ئامانجە دووماهییەکەی لا دووپات دەبێتەوە و گەریش بە وردی چاوت بە هەموو ورد و درشتی کتێبەکەدا گێڕا بێت، دەزانیت، کە ئەمە وێڕای هەموو شتێکیش تەنانەت لە بالیش سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، گەر هاتوو دەوڵەت شانۆیەکی نەبوو یا غەیری ئەمە، توانستی بە زۆری و وابەستەیی، بەم جۆرەش لە کۆتایی هەڵدەگەڕێینەوەو بۆ خاڵی سەرەتا دەچینەوە.

یاخود کەڕەتێکی دیکە بۆ ئەو کتێبە دەستەجەمعیە بگەڕێنەوە، کە وەکو دەقێکی مەرجەعی نوێخوازی لەمەودوایی (پۆستێرن) بەکارمان هێنا، کاتێ رابینۆ، لەمەش راست دەرچوو، هاوەڵەکانی هاندا بۆ دیقەتدان لە «سیاسەتی دالاٌنەکانی» ئەکادیمیایی، لەبری هۆتاف لێدان بەو دروشمانەی دژ بە کۆلۆنیالیزم، کە چیدیکە مەبەستیان نیە، ئەو سەرنجەی داوە بۆ هاندانیان بۆ ورەبەرنەدان بە مەبەستی داماڵینی ماسکەکە [٥٩].

(ئێمە دەزانین، کە زێدە شێوازی تەکنیکی باو،

کە هەر گروپێکی دەستەبژێر بەخۆوەی دەگرێ، بریتییە



لە رەتدانەوەی گفتوگۆکردنی ئەو کێشانەی، کە بەلای

ئەوانەوە قووت ناچێ، بەو پێیەی بێ نرخ و بایەخدار نییە).

سەرنج بدە متمانەی پەنهانکراوی دستەواژەی «ئێمە دەزانین» بەڵام سەرنجی ئەوەش بدە ئەوەی بۆمان خراوەتە روو بریتیە لە گشتاندنێکی هەمەکییانەی گوزارشکەر لە رۆشنبیریی، تایبەتمەندییە رۆشنبیرییەکانی واتا دەبڕێت — دەسمێت — و بەمەش پێدەچێ ئەو جۆرە کارە وێڕای هەر شتێك شیاو بێت لەرووی سەرزەنشتکردنی پۆزەتیڤیزیست، بەهەرحاڵ، بەکار دێت، بەڵام گەر کارەکە بەم شێوەیەیە ، پێویست بەوە ناکات گفتوگۆیەکی زۆرتر بکەین لەوەی پێویستە بەتخوبەکانی ئەو جۆرە هەقیقەتە یا نەزعەی بابەتیانە، سۆسیۆلۆجیانە، باو، بەودەرخستنە بە فرتوفێڵاوییانەی «ئەویدیکە» کە ناکرێ تەنیا بە هۆی — چی ناو لێنراوە — جیاکارێتی زمانەوانی پۆست مۆدێرنیزم...نەبێت، وێکنا چوێنرێن و لێکنزیك ناکرێن؟ .

کتێبێکی لێوانلێو لەو جۆرە حاڵەتانەی شلەژاویی و لێك وە دوورکەوتن و نەگونجان، هەریەك لە «تەفسیری تەئویلی» و ڕێژەییخوازان گلەکەیان ئامادە کرد و ئەوەش دەسکەوتی بەروبومەکە بوو !.

بۆ کورتکردنەوەی ئەوەی وترا دەکرێ بڵێین: کۆمەڵگە مرۆییەکان لە نێو پەیوەندییەکی ئالۆزکاوی کارلێککراوانە دانە لە نێوان هۆکارە دەرەکییەکان — بە زۆریی، بەرهەمهێنان — و لە نێوان واتا ناوەکییەکان، ئەمەش راستییەکە گومان هەڵناگرێ و ناشکرێ بڕیارێکی پێشوەختە بەسەر سرووشتی وردەبیانەی ئەو کارلێککردنە دەربکەین بۆ بەرژەوەندی براوە و سەرکەوتوو و دەستڕۆیشتوویی هۆکارە ((ڕۆشنبیریی)) یا سیمانتیکی — یەکان، ئەمەش تەنیا دوا بە دوای ئەنجامگیری و لێکۆڵینەوە و تاوتۆکردن دەبێت و بەئەنجام دەگات. هەقیقەتی سەرەکی جیهان هەروەك چۆن ئێستا چی بووە، لە رەتبوونی بە قۆناغێکی گوێزەرەوەی چارەنووسساز و گەوهەری خۆی دەنوێنێ، دەرئەنجامی حاڵەتێکی قووڵ و نامەفهوم بە شێوەیکی راست لە نایەکدیگیریی نێوان شێوازێکی جیای ڕۆشنبیری و تێکڕای شێوازە بەجێماوەکانی دیکە.

پۆست مۆدێرنیزم، بزووتنەوەیەکە کەوا لە رووی ئەو میتۆدەی داوای پێڕەو کردنی دەکات (سەرەڕای خەوشە لابەلاییەکانی دیکە — پەنهانی، هەڵبەستەییەتی، دەستبەسەرا گرتنێکی پوکاوە، نمایشکاریی شانۆیی، ئیدعای مەعریفەی ڕۆشنبیری) زۆر هەڵەی کوشندە دەکات. ئەو هۆگریی و ئالودەییە بەتینە و گرنگیدانە جیاکەرەوە سێنترالیزەکەی سەر تایبەتمەندێتی سیمانتیکیانە، لە ئاست دیتنی رووکارە نا سیمانتیکییەکان لە کۆمەڵگە، کوێریان کردبوو، لەمەش فرە گرنگتر، لە ئاست ناریزبەندیی باو بە شێوەیەکی ڕەها وبەگوڕ لەمەڕ هێزی مەعریفی و ئابووری لە ڕەوشی جیهانیشدا.

ڕێژەگەرایی، کە خواست و مەبەستی بووتنەوەکەیە، چ جۆرە بەرنامەیەکی بە میتۆدکراوی نە لە سیاسەت و تەنانەت لە ئەنجامگیریش نەلەلای هەیە و نەدەشتوانی هەیبێت، هۆیەکەشی لەوەدایە، کە دیاردەیەکی سروشتی دەستکردە: ئەوانەی پێشنیازی دەکەن یا دژ بە رەخنەگرانی داکۆکی لێدەکەن، بەردەوامن لە سەر کارکردن بە پێی ئەگەرێکی نارێژەیی بەجۆرێك ئاماژە دەدا بە جیایی تاکە دیتنێکی دیاریکراو، بەهۆی کاریگەرییەتێکی کاملتر — هەرە کامڵ — لە رووی مەعریفەی ئیدراکی بە بەراورد دەگەڵ دیتنەکانی دیکە، ئەمەش هەرکاتێ هەر پرسێکی جیددی بایەخدانێکی (گرنگێتی) هەقیقی لایان هەبێ، رووبەڕوویان ببێتەوە، وێڕای داننان بەوەی پەیرەوکارانی ((پۆست مۆدێرنیزم)) پێنگاڤێکی دوور بە ئاراستەی دەستبەردار بوون لە ئەنجامگیریی و لێکۆڵینەوە — و تیۆر ملیان نا، هەروەها گۆڕینیان بە هەوڵدانێکی کردەیی لەمەڕ دووبارە هێنانەوە ئارای خودی بابەت، واتە مانای ((ئەویدیکە)) ئەوەش بە ڕێگەیەك وای لێبکرێ لە جیاتی خۆی و بەبێ پێناو — وساطە — قسە بکات، وەلێ ئەوان لە کۆتاییدا دەروازەیەك شك نابەن بۆ پەنا بردنەبەر ئەنجامگیرییەك، لە بابەتەکە لە چوارچیوەی جیهانێکی هاوشێوە لەوەی تاکە رۆشنبیریی ((زانستی)) زاڵ، دەرکی پێدەکات.



بەڵام ڕێژەگەرایی بە سانایی بەو پێیەی هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی یا سیاسییە قابیلی پراکتیزەکردن نییە، هۆیەکەشی بریتیە لە پێشێلکردنی هەمان ئەو رۆشنبیرییانەی کە لە جیاتی ((زانستی تەئویل)) (هیرمنیۆتیکا - hermeneutic) بە بناخە رێژی و پتەو کردنی یەکسانییەکەی دەگات، چون خولیا و هۆگریی ئەمەیە بۆ پەیداکردنی هێزی تەکنەلۆجیایی، هۆیەکەی دیکەش لەوەدایە، کە بەلای کەمی هەندێکیان (نەخاسمە ئەوەی لەوەیە دووچاری مەترسیە "بنەوانگیریەتی" یەکان بێت) بە کەفوکوڵن، ئەوانیش لەمەدا راستن بۆ رەتکردنەوەی هەر هەوڵێك بە مەبەستی دووبارە راڤەکردنی بیر و بڕوا تایبەتمەندییەکانی بە رۆحێکی ڕێژەگەرییانە، ئەو رۆشنبیرییانەش مەبەست و مەرامیان لە بیروباوەڕ و مەزەندەیان سەرچاوەی گرتووە، ئینجا ڕێژەگەرایی بەر ئەو هەقیقەتە دەکەوێ، کە بە جیهانمان پەیوەستە، ئەو هەقیقەتەی کە خودی خۆی لە چوارچێوەی دیکە دەیهێنێتەوە ئاراوە (یاد)، ئەویش ئەو سروشتە تێکچڕژاو و بە یەکدا چوو و بێبارەی (رۆشنبیرییەکان)ە، ناشکرێ بۆ ئێمە ئامۆژگاریی خەڵکی بکەین ئاوها لە رۆما هەڵسوکەوت بکەن هەروەك خەڵکەکەی هەڵسوکەوت دەکەن، کاتێ تخوبە جیا — دیارە — کەی یا جێگرەکەی، لە دەستدەدات.

گەیشتن بە لێکحاڵیبوونێك لەگەڵ ئەو لێکترازانە جیهانییەی، کە زاڵییەتی تاکشێوازی مەعریفی نایەوە، کارێکی هەروا ئاسان نییە، مسۆگەریشە کە لێرەدا بە کۆتا نایەت، بەڵام ڕێژەیی رواڵەتیانە ئامرازی یاریدەدەر نییە، ئەو تەنیا دیاردەیەکی ناسروشتی دەستکردە، سەرنجڕاکێشە لە نێوەندە لادێگەرە زێدە ساویلکەکان لەچاو رۆشنبیرییە دەوڵەمەندە خودا پێداوەکان — ساماندار و خودان ئیمتیازات، ئەوانەش ئەگەری ئەوە دەخەنە روو، کە ئەو قلپکردنە پێچەوانەییەی بۆچوونی کۆنیان ئیدی ناچاریان دەکا بۆ پاشگەز بوونەوە لە خەتای کەڵك وەرگرتن لەو ئیمتیازاتانە و یاریدەیان دەدا بۆ فامکردنی ئەودیدی و دەرککردن بە خود و دەرککردن بە تەنگ و چەڵەمە هاوبەشەکەمان، بەڵام بەداخەوە کێشەکە بەو رادە و پلەیە سادە و ساکار نییە.

وەکو ئەو نوێخوازییە پۆستێرنە گەلەك گرنگ نییە، ئەمە داهێنراوەیەکە لەچاوترووکانێکدا دەپووکێتەوە، بەو - سەرنجڕاکێشیەی — قەرزباری ئەوانەیە هەرچی لێوەی قووت دەبێتەوە لە رووی نوێگەریی و پەنهانیی ئۆرگینالّی لوغزدار، کارەکەش زۆر ناخەیەنێ بەر لەوەی بکەوێتە ناخ بنی بنەوەی لە یاد چوونەوە، بە تەواوەتی هەروەکو داهێنراوەکانی دیکە دووچاری دەبن، بەڵام ئەو عەینەکی نمونەیی ڕێژەگەراییە، ڕێژەگەراییش پرسێکی گرنگە و ناشکرێ پێشبڕی ڕێژەگەرایی بکەین، لەبەر ئەوەی پەیرەوی عەدەمییەتی ئەخلاقی دەکات وەکو ئەنجامێك کە هەر دەبێ وا بکەوێتەوە (بە راستیش ئەمە ئەوە دەکات) عەدەمییەتی ئەخلاقی ئەستەمە لە هەر کێشەیەك بە دووری بگرین، بەڵام دەکرێ پێشبڕی بکەین، چونکە دەبێتە هۆی عەدەمییەتی مەعریفی، کە زۆر بە سانایی، پرسێکی قەڵپ و ساختەیە لەبەر ئەوەی ئەو ڕێگەیەکە لە میانیدا دەتوانین بە کردەیی لە کۆمەڵگە و رۆشنبیرییەکان بگەین، ئەم ئەو ڕێگەیە دەشێوێنێ و لە ڕێی لا دەدات، بەمە ئەو جیاوازییە پێشومارانەی مەعریفە و هێزی تەکنەلۆجیا دەبوغزێنێ و نکولیان لێدەکات، ئەوانیش جیاوازیگەلی چارەنووسسازن سەبارەت بە فامکردنی پەرەستاندنە هەنووکەییەکان لە کۆمەڵگەی مرۆیی، هەروەها ئەو روئیایەی پێی وایە لەشتە هەرە پتر گرنگەکانە بە پەنهان ولوغزبار لەقەڵەم دەدا، کە ناکرێ بە راست و دروست لەقەڵەم بدرێ.



## کەسایەتییەکان

دوور نییە درامایەکی شانۆیی چاك باس لە تەنگوچەڵەمەیەکی مرۆیی بکات وەکو شانۆگەریی دەرگا داخراوەکانی سارتەر، سێ کەسایەتی بگرێتەخۆ، هەریەکەیان لە میانی تەنگوچەڵەمەیەکی تەنگانەیی بەسۆی بێبااردا بەویدیکە ببەسترێتەوە، بەڵام دەرباز بوون لێی ئەستەمە، ئێمەش دووکەسمان لەو کەسایەتییانە خستەڕوو، تا رادەیەکی زۆریش لە رووی قەوارە و گرنگێتی هەست بە ریزبەندیی و هاوکوفیان ناکەین .

فەندەمینتالّیزمی ئایینی ئیسلامی، بزووتنەوەیەك دەنوێنێ لەرادەبەدەر سادەیە و بە چەمکی هێزەکەی ناسراوە، جاروبار بە دڵڕەقییەکەی و مەناعە کۆمەڵایەتییەکەی، سەرەڕای رووە دنیاییەکەی و هێزوتوانای سەرنجڕاکێشان و گرنگی و بایەخپێدان بەجۆرێك هەست ونەستێك(حسێك) بەرەوڕووی ملیۆنەها کەس دەکاتەوە، زۆربەی هەرە زۆریان لە هەلومەرجێکی زیندەگییانەی ئەوتۆدا دەگوزەرێنن، کە بە دەست هەژاریی و نەدارییەکی کوشندەدا دەتلێنەوە و دووچاری سەختترین جۆری چەوسانەوە و سەرکوتکردن دەبنەوە، هەروەها بە گەڕیان دەخا بۆ گونجاندن لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی دەستەجەمعی تازە، کە چ کەسایەتییەکی دیار و جیاوازی نییە، لە میانی شانازی کردن بەو رۆشنبیرییە باڵا دێرینە و رەگداکوتاوەی ئایینزا تایبەتەکەی ئیمانیان و راڤەکردنی ئەو حیرمانە و زەلالەتەی بەدەستیەوە دەناڵێنن، گوایە ئەمە سزایەکە بۆیان لەسونگەی لادانیان لە راستێتی— سیراتی موستەقیم — نەك وەك دەرەنجامێك بە هۆی بێتواناییان لەمەڕ دەستنەکەوتنی: لەبەر ئەوە لێکترازان و لادان لە ڕێی راست وەردەچەرخێ بۆ جۆری لە هەڵکشانی شکۆداریی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی، ئینجا بۆ هەوڵی پەیداکردنی شوناس و کەرامەت .

ده هەمبەر ئەوەدا، پۆست مۆدێرنیزم تا رادەیەك بە بیدعەیەكی بەپەناوپێچی دەستكرد، لە قەڵەم دەدرێ، بە زۆری ئەوانەی پیادەی دەكەن هەندێكن لەو ئەكادیمیستانەی ژیانێكی ئاسوودە و ئارام بەسەر دەبەن هەروەها چەند بەشی گەورەی هەیە (بەزەحمەت نەبێ) لێی تێناگەن تەنیا ئەوانە نەبن، كە بە تەواوەتی بە توانا و شیاون بۆ جیاكردنەوەی ئەو جیاوازییە وردە سستوخاوەی نێوان سێ یا چوار لكی دژواری مەعریفی ئەكادیمی لە زۆربەشیان هەرگیزا و هەرگیز تێناگەیت، بەڵام ئەوە بوو روویداو بوو بە فۆرمێكی رێژەگەرایی هاوكوف لەگەڵ بیدعەیەكی مۆدرنی باوی ئەم رۆژگارە، رێژەگەراییش خۆی لە خۆیدا بژارەیەكی گرنگی فیكریە. بەردەوام لەگەڵماندایە، تەنانەت گەر ئەو فۆرمەی بە خۆیشی دادەبڕێ جودا بێ —بە خێراییەكی زۆریش — لەگەڵ هەڵگەڕانەوەیەكی خێرای فیكری ئەكادیمیایی، رێژەگەرایی لە میانی ئەو بەرجەستەكردنەی ئێستای لە نێو بەرژەوەندیەكی واقیعی ماددی دیاریكراودایە.

لەگەڵ ئەوەشدا و وێڕای بەراورد نەكردن لە نێوانیاندا، ئەوە ئەو دوو عەینە نمونەییە هەڵبژاردراوانە كردەیەكی جیاوازكارانەی مكوم لەرووی لۆجیكی بیروباوەڕەكانیان ئەنجام دەدەن. یەكەمیان، ئایینێكی تەوحیدی توندخواز و سادەیە جەخت دەكاتە سەر ئەوەی خودا وای لە جیهان كردووە بە ئاسانی بە ئیرادەی ئەو بزانێت و بەدی بێنێت، ئەركەكەش جێبەجێ كردنی ئەو ئیرادەیە و سازدانی تاكە بنكەی مومكینە بۆ دامەزراندنی سیستەمێكی كۆمەڵایەتی بێ وێنە لە رەوایی و دادوەرییەكەی، دەسەڵاتی رەهای خودایی، ئەودیو-میتا- دەرەكی بە هەموو زەبرێكەوە لە چوارچێوەی ئەو جیهانە و رۆشنبیرییە فرەجۆرەكەی، خواست و مەرامی خولقێنەر بە سەر خولقێنراوەكەی دەسەپێنێ: ئیرادەی ئیلاهی جیاواز و شكۆدار كتومت رەوایی خۆی لە بنەما دەرەكییە پەتییە رەهاكەی سەرچاوەی گرتووە، بنجداكوتان و ساكاریی ئەو ئایینزایە و تواناكەی بۆ تێگەیشتن، میهرەبانی و شكۆداری پێدەبەخشێ وبە ملیۆنەها كەسیش ئەمڕۆ لەرێی گوزەراندن لە هەمێزی



شەریعەتەكەی رەزامەندی و قەناعەت، بەدیدەكەن، هەڵبەت دەلالەتێكی گەلەك گرنگیش لەمەدا هەیە.

دووەمیان: لەوێدا بزووتنەوەیەك هەیە نكۆڵی دەكات لە شیمانەی هەبوونی دەسەڵاتێكی دەرەكی و شەرعیی ئەودیو-میتا- جیاواز و ڕاست و كارتێكەرانە و دەشبێ دان بنێین بەو هەڵوێستە تایبەت و مكوڕە، توندەی لە مەڕ ئەو نكۆڵیكردنە، لە كاتێكدا لەلایەن ئەندامە نارێژەییخوازانی نێو كۆمەڵگە تایبەتەكەی خۆیان تەئكیدی بە پێچەوانەوە تەئكیددەكەنەسەر سەلماندنی ئەو جۆرە بە شەرعی كردنەدەرەكیە جیاوازە.

لە لایەكی دیكەوە ئەو شەرم و حەیایەی رێژەییخواز پێی گیرۆدەیە، دەیچەپێنێ (لە چەپاندنەوە).

سەرەڕای پاشگەز بوونەوە لە هەستكردن بە گوناه — ی كۆلۆنیالی پێشوو، جەخت كردنە سەر ئەو خاڵە بۆ ئەندامانی رۆشنبیرییەكانی دیكە و مامەڵەیەكی جیاوازیش دەگەڵ رەهاگەرێتی ئەوانیدیكە دەكرێ، هەروەها هاوسۆزییەكی گەرموگوڕانەی ئەوتۆ زۆرنزیك لە ئاستی پەسەند كردن و رەزامەندیدان .

ئەو وای دەردەخات مەعریفە یا فەزیلەی ئەخلاقی لە دەرەوەی رۆشنبیریدا تەنیا وەهمە: هەر رۆشنبیرییەك پێویستە مەعریفە و فەزیلە ئەخلاقییەكەی بڵاو بكاتەوە، واتاكان تارادەیەكی زۆر بەبێ ریزبەندی وهاوكوفین، واتاكان لە رروی رۆشنبیرییەوە رۆنراون و لێكدراون. بەمەش گشت رۆشنبیرییەكان یەكسانن و ناشكرێ بە بێ رێزگرتن لە كەرامەت و جێگە و رێگە و یەكسانیی رۆشنبیرییەكانی (دیكە)، ئەنجامگیرییەكی گشتگیر بە هۆی رۆشنبیریی یا سیمانتیكی بە ئاكام بگات، گەریش توانستە شیكەرەوانەییەكەی روون و شیاوی متمانە بوو، ئەوە بەلای كەمی ئاست نزمێكی زمنییە بۆی، لەبەر ئەوەش دەبێ لەرێی غموزێكی لوغزداری لەرزیو — راچڵەكاو رێگەچارەیەكی نالەبارو شپرزەو و ناتەبا لێی بكۆڵدرێتەوە، بەمجۆرە غموز بۆ نیشانەیەكی هێمایی ئاوەژوو دەبێتەوە، تەنیا بەو قووڵییەی لە قەڵەم دراوە

ناناسرێتەوە، بەڵکو بە ڕێزنان لە هەموو ڕۆشنبیرییەکان و خۆ بە دوور گرتن لە باڵادەستی و زاڵییەتی.

یەکەمین بزووتنەوە لەو دوو بزووتنەوەیە تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕووی ریزبەندی و ڕێکوپێکی بێبەشە لەڕووی ڕوئیاکەی بۆ ڕەوشی ئایدیۆلۆجیایی جیهانی: ﴿لا الە الاالله﴾ جا وێڕای هەبوونی لیستێکی ریزبەندکراو و دیاریکراو لە هەردوو ئایینە نووسراوەکەی دیکە ئەوە هەموو خوداکانی دیکە نادروستن و هەموو پێغەمبەرانی دیکەش بە هەمان شێوە، بەمەش جێگەوڕێگەی — ئەهلی زیمە — بە سەر پێڕەوکارانیان دادەبڕێ (گەرچی لە هەندێ سەدەی پێشوو سووکایەتیان پێکرا)، بەڵام بت پەرستان دەبێت بەلای کەم سەرپشك بن لە ڕووی پرەنسیپەوە لە نێوان هیدایەت یا شمشێر، ئەمەش بە پێی نوسخەی فەرمی ئەقیدەکە، کە نابێ لێی دەربچی — نکۆڵی لێبکەی - مرۆش ترسی ئەوەی هەیە، کە کەمێ ڕەنگە بە سوودتر بێت بۆ ئەو خوانەناسانە گەر هاتوو بە لاڵانەوە پاڕانەوە، بە قسە نارەزاییان دەربڕی کە: واتا دەلالەتییە — وەسەنییەکانیان — هەمان ڕەوایی واتاکانی دیکەیان هەیە، چونکە هەموو واتاکان یەکسانن و هەموو ڕۆشنبیرییەکانیش خودان شەرعیەتی خۆیانن، بەمەش نابێ خەڵکەکەی بە شمشێر بکوژرێن، هەروەك چۆن ئەکادیمیستە هەرە زێدە بە شانوشکۆ و پلەوپایەکان، بنەبڕانە دیاریان کرد و بناخە ڕێژیان کرد، بەڵام شمشێرەوان تەنیا بە دەقێکی شایەتمانەی فتغنشتاین دڵنەرم نابێت، لە ڕاستیشدا، لێرە بەڵگەیەکی روون نییە، تاوەکو بەزۆر دینگرتنی کافران جا لەبەر هەر هۆیەك بێت، بسەلمێنێ: بناوانگران بە هەنگاوێك بەر لەوە ستۆپیان کرد، بەڵام حاڵەتگەلی ئەوتۆ هاتنە ئاراوە هەر لە تۆمەتبار کردن تاوەکو مردن و حەلاڵکردنی خوێنی گومڕاوو لە ڕێ لادەر بە تاوانی هەڵگەرانەوە لە ئایین (گەرچی ئەمە بە کردەیی جێبەجێ نەکراوە)، یەکێ لەو تۆمەت بارکردنە بەد ناوانەش دژ بە هەڵگەڕاوەیی بوو، لە دەرەوەی تخوبی دەسەڵاتی قەزایی سەر بەو دەسەڵاتەی ئەو بڕیارەی دەرکردووە.



پەیوەندی نێوان ئەو دو کەسایەتییە لەو دراما شانۆییەدا، مایەی بایەخ و سەرنجدانە، لای ڕێژەییگەرە — تەئویلییەکان تاسە و خولیایەکی بە کەفوکوڵ هەیە بۆ خستنە ڕووی لێبوردەییان لەگەڵ فەرهەنگە بیانییە خۆرئاواییەکان و لێتێگەیشتنیان بەهەرچی هەیە لەوحاڵەتەجیایەی لێبووردەیی وفامکردنیان لەڕووی گشتگیری و گەردوونێتی و جیهانێتی، هەر چەندەیش سەرسامیی زێدەتربوو و ڕادەی هێدمەو تەشویش و بێزاریی سەبارەت بە کۆنسێرڤاتە ماددیەکان ئاڵۆزتربوو، ئەوانەی لە نیو چەوانیان نووسرابوو کە لادێیەکی ساویلکانەی خودی کۆمەڵگاکانیان بن، ئەوە هێندە چاکترە بەڵکە زۆرچاکتر، چوون هەرچەندە توندیی هێدمەی ئەویدیکە زیاتر بێ، ئەوەندەش ئەو فامکردنە چاوگەی بایەخدانی ڕووەو باڵادەستی تەئویلی ڕۆشنگەرە لە نێو خودی کۆمەڵگەکەیدا، هەرچەندەیش ئەو فامکردنە بە ئەستەم بێ، بەو ئەندازەیە تەکینەوەی بابەتەکە پتر دەبێ (دەهەمبەر خود) کە مەبەستییەتی پۆست مۆدێرنیزمی تەفسیری تەئویلی بگرتە خۆ و پیرۆز بکات و قەوارەی دەستکەوتەکەی زلتر و ڕۆشنایەتی و بیرتیژیەکەیشی فراوانتر بکات.

بەڵام لە سەر ڕاڤەکاری تەئویلیانەیە کەمێ دوورە پەرێز بێ لە ڕادەربڕینی لە بارەی هەقیقەتی ئەوانەی حەز بە لێبوردەیی و لێتێگەیشتنیان دەکەن، ئەوانە هەمیشە بە هەمان ڕادەی لێبوردەیی بەرچاو ناکەون، ڕێژەییخواز ڕەها گەرایی ئەوانیدیکە پەسەند دەکات و بەمەش ڕەهاگەرێتی دژیەکەکەی و ناکۆکییەکەیشی شوێن ڕێژەگەرییەکەی دەکەوێت، لێمان گەڕێن لەگەڵ ئەو کێشەیە بەجێی بهێڵین، لێرەدا چ ڕێچکەیەکی دەرچوون لێی لە ئارادا نییە.

لە لایەکی دیکەوە، بناوانگران گەلەك بە ڕێژەییخوازان سەرقاڵ نین و بە هەندیان ناگرن، گومانیش لەوەدا دەکەم داخوا بەو بیرکردنەوە زۆرەیان خەوشداریان بکەن، ئەوان سەرنجبان لەوەدا: ئەو کۆمەڵگەیەی تەئویلییەکان پەنا دەدا هەروەك چۆن ئەوانیدیکە پەنا دەدا (ئەو تاقەتی بەسەر ئەمەدا دەشکێ) فرەیی و گومان و

بێحەماسەتی باڵی بەسەرکێشاوە، هەروەها قبووڵ نەکردنی کتـەمتی بـڕوا ئیمانییـە پێشووەکەی و پێڕەوکردنێکی لەرادەبەدەری ئەو بیروباوەڕە .

ئەوانیش بـە تـەواوەتی روون و بەرچـاو نـین لـە بـارەی ئـەوەی داخـوا بـە هـۆی لێبوردەییەکەی رقیان لێیەتی وبەهەندی ناگرن، یا بە گژیدا دەچن لەبەر ئەوەی بەپێی پێویست لێبوردە نییە، نەخاسمە لە ئاست توندوتیژیان و رك وعینادیان: ئەوان رەنگـە یەکبەدواییەك بکەونـە ژێـر رکێفـی ئـەو دوو بیرۆکـە سـۆزبارییە، بـەڵام رونـاکبیرە موسڵمانەکانی دانیشتووی خۆرئاوا ئەوانەی سزای مەرگیان لە جەزای هەڵگەڕانـەوە و کوفر بە خوا دژی رۆماننووسێکی موسڵمان پەسندکرد، بەمە کۆمـەڵگەی میواندارییان -خانـەخوێ- بـەهۆی ئـەو لێبووردەییەهـەڵبواردراوە قێزانـد، بـەڵام ئـەوان ئـەو نائامادەیەی سەرزەنشت دەکەن لەمەڕ پەسەندکردنی لە سەر / یـا لێبـوردنی لـەوەی ئەنجامیاندا لەرووی سەپاندنی یاسایەکی بە زەبر و دڵڕەقانە بەسەر یەکێ لـە برایـانی دینییان.

هەڵبەتە، هەموو ئەمانە، واتە: لێڕوانینێکی گشتی کارەکە لە هەموو لایەکـەوە، سروشتیشە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە وردودرشتی بابەتەکە جیاوازیی زۆریش لـە ئـارادا هەبێت.

هەندێکیان بە ڕێگەیەکی تاکڕەوی لێبوردانە و ئەقڵانی بە دینێکەوە دەنووسـێن و گوێ دەگرن لە بیـانو و بەڵگـەکانی ئەوانـەی بەشـداری شـتەبەراییە لۆجیکیانەکـەی ناکەن، هەروەها وای لا چاکترە پەنا بۆ ڕێبازی دیالۆگی هزری ببات، لەبری تـوڕدان و دوورخستنەوەیان بە گوێرەی نوختەنیگای ناکۆکیەکە هزریەکە.



## بژارەی سێیەم

لەوێدا هەڵوێستی سێیەم هەیە لەو گەمە یا دراما شانۆییە، هەڵوێستێکە لـە روویەکەوە لەگەڵ هەردوو کەسایەتیەکانی پێشوو، کە رۆڵی پاڵەوانێتیان تیا بینی بەشداری دەکات، بەڵام نیشانە و ئەدگاری ئەوتۆی هەنە تارادەیـەکی زۆر لـەوانی دیکەی جیا دەکاتەوە، داخوا دەبێ ئەو سیفەتانە چی بن؟ .

ئەوەیان هەڵوێـستێکە بـە تـێن وتوندانـە وەکـو هەڵوێـستی بنـاوانگرانی ئـایینی، دەربەستە بە رەتکردنـەوەی ڕێژەگـەرایی و وابەسـتەیە بـەو رایـەی دەڵـێ: مەعریفـەی ئەودیوییانە، بابەتییانە، هەیە تخوبەکەی دەترازێنێ: لە راستیشدا ((مەعریفەی ئەویـدیو رۆشنبیریی — پۆست کەلچەر)) هەیە. چون لە سـەر تێکـڕای مەعریفەیـە، لـە میـانی دەستەواژە زاراوەییە زمانەوانییەکان گوتراو بێت، بـەڵام لەوێـدا دەسـتەواژەی زاراوەیـی ئەوتۆ هەن توانادار بۆ دارڕژتنی پرسیار بە ڕێگەیەك وەڵامەکان لـە لایـەن تایبەتمەندییـە جیاکانی دەستەواژەی زاراوەیی زمانـەوانی یـا ئـەو رۆشـنبیرییەی لـە هەگبەیـەتی بـە سەپێنراوی نادرێنەوە، بەڵکە بە پێچەوانەوە، بەهۆی هەقیقەتی واقیعی سەربەخۆ.

توانای دەرککردن بە — سمینی — تاڵە دیاریکراوەکـانی هـەر قۆزاخەیـەکی یـەك رۆشنبیریی و پەیداکردنی شێوە مەعریفی لەبار و رەوا بۆ هەمووان — و بە ڕێککەوت بۆ فامکردنی سروشت دەبنە هۆی پوختەکارییەك یەکبینە بـەهێز دەبـێ — ئـەم ئـەو هەقیقەتە سێنترالیزەیەی بارودۆخـە کۆمـەڵایەتییـە هاوبەشـەکەمان فۆرمەڵـەدەکات، هەروەها ئەو هەڵوێستە لە لایەکی دیکەوە، خودان هۆکارێکی هاوبەشیشە لەگەڵ ئەو ڕێژەییخوازانەی لێیان دەدوێن: ئەو باوەڕی بـە (سـروش) وەحییـەك نییـە هەقیقـەت ئاشکرا دەکات و بە گەوهەریەتیەکەی و بە کۆتایەتیەکەی و جیاکـاریی و باڵادەسـتی بە سەر جیهان هەم جیاو هەمیش ناسراوە، بەڵکە باوەڕی بە مەعریفەیـە کـە تخوبی رۆشنبیریی رەتدەدات، هەروەها دەربەستە بە ئەسڵی دنیایی مەعریفە و سروشـتە لـە هەڵە نابەدەرەکەی، بەڵام ئەوە بە توندی لە خۆیدا شیمانەی وەحی سەرزەنشت دەکات

و ڕێگەش بە هیچ ڕۆشنبیرییەك نادات بەشێك لـە خـودی خـۆی بـە شـەرعی بكـات بـەهۆی دەسـەڵاتێكی هەتاهـەتایی و بڕیـاردانێكی تەئكیدییانـەی گەوهـەری بـە سەرپشكایەتیەكەی و بەخشینی لە ملكەچبوون بۆ پشكنین و ورد بوونـەوە، هـەروەها ئەو بۆچوونە لەوەی پەیوەستە بە حاڵەتە كۆمەڵایەتییەكەیـشی لەنگـەر دەگـرێ، لـە شوێنێ دەكەوێتە نێوەڕاستی ماوەی نێوان هەردوو هەڵوێستەكەی دیكە. چون ناكـارێ وا رابدێری، كە ئیمانی بڕوا هێنی بەرنامەرێـژ پێكـدێنێ، كـە ملیۆنـەها لـە خـشتە دەبات و ناكارێش بە هەرچی هەیەتی لە دەسـتپاكی و راسـتگۆیی بانگەشـەی ئـەوە بكات، گوایە پشتگیریی گەلە جەماوەرییێكی مەزن لە عەوامی خەڵكدا دەكات و بەو پێیەی قابیلی فامكردنە بەلای ئەوان و توانای ئاخاوتنی هەیە بە زمانێك ئەوانە تێی بگەن، ئەوانەی ڕووبەڕووی دلڕەقی و دژواری واریقاتی ژیانی ڕۆژانە دەبنەوە، هەروەها كۆمەكیكردن و پشتیوانیكردنیان لە گەرمەی مەینەتیە بەسۆیەكاندا.

لە لایەكی دیكەوە، بە مـسۆگەریی، لـە گلانێكـی بەسەرچـووانەی ئـەكادیمیایی تاكوتەرا زێترە، سكێچە هەمەكیانەكەی بۆ یەكـەمجار لـە میـانی ڕەوتـی شۆڕشـێكی زانستی لە سەدەی حەڤدەهەمدا بە دیار كەوت، ئینجا بە شێوەیەكی دوور و درێژ لـە سەدەی هەژدەهەمدا پیادە كرا و ئەو هەڵوێستەی دەكرێ بـە بناوانگرایـەتی عـەلمانی ڕۆشنگەریی وە سپبكرێ بوو بـە جیفـرەی نەنووسـراو، بـەڵام دان بەمـەنرا لـە سـەر ئاستێكی فراوانی بنەماكانی ڕەفتاری ئیدراكی مەعریفی چەندان (بەڵام نەك هـەموو) هزرڤان و ڕۆشنفكریی شارستانیەتی زانستی پیشەسازی.

فەیلەسوفەكان دەزانن چۆن چۆنی لەرێی دەستەواژەیەكی ئەوتۆ بێ هەڵـە، ڕوونـی بكەنەوە وێڕای لایەنگیری نەكردن و بڕیـار لـە سـەر نـەدانی حـاڵی حـازر لـە لایـەن هەموویانەوە ئیدی هەر لە زەمانێكی زوودا بەمە نەدەوەستا لـەوەی بـەلای زۆربـەوە قەرزێكی باو بێ لەئەستۆیاندا. ئاسانە بە ڕێگەیـەكی میانڕۆییانـە دابڕێـژرێ، بـەڵام ڕەنگە بە دیقەتێكی تێر و تۆكمە نەبێ، لەگەڵ ئەوەشـدا دامەزرانـدنی دەسـەڵاتەكەی یەكبینە ئەستەمتر دەبێت.



چۆن دەكرێ ئەو هەڵوێـستە شـیمانەی سـروش لـە دەرەوەڕا ڕەتبكاتـەوە، لەگـەڵ ئەوەشدا پێدا دەگرێ لە سەر هەبونی مەعریفەیەكی ئەودیویانە — دەرەكـی — تخـوبی ڕۆشنبیریی دەترازێنێ؟ لە راستیدا ئا ئەمەیە پرسـیارە یەكلاكەرەوەكـە. یەكـەمیان، دانپیانان.

با لە جوغزی گفتوگۆدا ئەگەری ئەوە — بە مەحاڵ - دابنـێین، كـە بێگومـان بـە تارادەیەك هەمان كەرەستەی فیكریم هەیە، بەڵام بە بێ ئاگەداریی تەواو و ببڕای بـبڕ بەو جیهانە، بە راستیش تا رادەیەك ئەو حەز و خولیـا و هیوایانـەی هـەمن، هـەقی خۆیان دەدەمێ، بەڵام بە بێ هیچ زانیارییەكی دیاریكراو، نەخاسمە لـەو بوارانـەی بـە شێوەیەكی تایبەت مایـەی بایـەخ و گرنگـی پێـدانمن و پەیوەسـتدارن بـە كۆمەڵگـە مرۆییەكان و مێژووی مرۆیی، یاخود ڕێمبدە ڕۆڵێكـی جیـا لـە گەمـەی ((حیجـابی جەهالەت))ی تەرزەباوی ئەم ڕۆژانە بگێڕم، ئینجا وا دابنێ یەكێكیان لـەو حاڵەتـەدا پێی ڕاگەیاندم، كە لەوێدا لـە راسـتیا هەسـارەیەك هەیـە پێـی دەڵـێن گـۆی زەوی، سیخناخ بە دانیشتوانی دابەشكراو لاوەكییانە بۆ كۆمەڵەی فرەجۆر لە كۆمەڵگەكان و ڕۆشنبیرییەكان،ئینجا وای دابنێ كەوا ئەوسا من پرسیم ئەو بارە باوەی سەر هەسارەی زەوی چییە، نەخاسمە لەوەی پەیوەندی هەیە بەو ئیدراك و مەعریفە و بڕوایە.

وەڵامەكەم، بە پشت بەستن بە پرۆسەی زەنكردن و ماقوولییەتی بەدیهی تاكوتـەرا (گریمانەی زەنكردنی پێشینەیی، چ زانیارییەكی هەقیقیی لا نییە) بەلای ئەو شـێوەیە دەشكێتەوە، كە هەندێ تەئویلییە میانڕۆكان لە واقیعدا دەیخەنە ڕوو، وێڕای هیوام بە نووسینەوەی بە شێوازێكی پەخشان ئامێزی زێـدە روون: بـە هـەرحاڵ ئـیتر لـە سـەر هەسارەی زەویدا هەیـە، ئیـدی ئـەو زەنكردنـە دەخەمـە مەترسـییەوە بـەوەی هـەر ڕۆشنبیرییەك ڕێگە و ڕێبازی جیای فامكردنی خۆی هەیە لـە مامەڵـە كـردن لەگـەڵ شـتەكان و پۆلینكردنیـان و هـەر كامێكیـشیان بیگـری پێـوەرە ئیـدراكی و یەكەمینایەتییە ئەخلاقییەكانی تایبەت بـەخۆی هەیـە، هـەر یـەكێكیش لـەوان تـا رادەیەك لە ناوەوەدا كۆمەڵەیەكی یەكترگرە، بەڵام وێڕای لوانی ئەنجامدانی پەیوەنـدی

پێکردنی پاژەکییانە — جوزئی — لە نێوانیدا، کاتێك ئەنترۆپۆلۆجیاناسەکان — شاعیران لێهاتوویی و شارەزایی و هەست و نەست ناسکیان هەیە -(جۆرێکی دیکە نییە درکی پێبکرێ) پراکتیزەی دەکەن، لێرەدا بە سانایی چ مانایەکی نییە ئەو پرسیارەی پەیوەستە بەوەی کام میتۆدە مەفهومییە رۆشنبیرییە جیاوازەکان ((راستەکەیە)). چونکە بڕیاردان لە سەر هەر کامێکیان ئەوە بەلای ئەویدیدا لادانێکی هەڵەییانەیە، پێویستە هەر کەسێکی رۆشنفکر و دانا و دنیادیتە و ئاگەدار لە نوێترین ڕا و بۆچوونەکان، خۆی لێ بە دوور بگرێ، ئەوەیە زەنکردنم، هەروەها وای دادەنێم، کە وەڵامەکەم خراپ نەبێ گەر هاتوو بەراییەکی بەراهی زەنکردنانەمان دانا، پەیوەست بە حاڵەتی گۆی زەویمان، هەروەك بەر لە چەرخی میحوەریی، لە قۆناخێکی پێشترێ لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی بەر لە زایین وابوو .

ئا ئەوەیە، کە مەزەندەی دەکەم و پێشم وایە زۆر لۆجیکیانەیە، کەوا مەزەندە کردنم بەم شێوەیە بێت.

بەڵام من، لە راستیدا، بەو جیهانە نامۆ نیم و بێبەشیش نیم لەو هەموو مەعریفەیەی پەیوەستە بە رێکخستن و مێژووە ناوەکییەکەی، زانیارییەکی گەلەك زۆرم لەبارەی ئەو دوو بوارە لا هەیە، بەهۆی ئامادەگیم بۆ ماوەیەکی زۆر لە سەر گۆڕەپانەکە و بایەخدانێکی مکومی تایبەتمەندانە بە هەرچی شایستەی بایەخ پێدانیانە، بەڵام تاکە هەقیقەتی واقیعی، کە بە راستی سەرسام و شەکەتبارانەن، لەوەی پەیوەستە بەو جیهانەی تیایدا دەژیم، لەو بوونە کردەییەی مەعریفەی راستەقینە خۆدەنوێنێ، کە تخوبی رۆشنبیریی دەبەزێنێ و منیش هەرگیز بڕوام بەوە نەبوو، کە ئەمە ئیدراکێکی بەدیهی بێ، چونکە من ئاگەدارییەکی چاکم لە بارەی گشت بەڵگە بەهێزەکان هەیە، کە نەشیانی هەبوونی — مەعریفەیی تخوبی رۆشنبیریی رەتدەدا، بە هەڵە و سەهوو لە قەڵەم بدات. هەروەها منیش بە تەواوەتی لە فەلسەفە گەیشتووم و بە بەڵگە بەهێزە سەلمێنراوەکانی دەزانم، کە ئەوە بە دیار دەخات، کە تێکڕای مەعریفە نەلواوە، کەواتە، بە نەبوونی بەڵگەیەکی بێوێنەی دژ، ئیدی بە



تەواوەتی رێز دەنێم لە ئەنجامەکانی ئەو بەڵگە خەفەکراو و کاریگەرانە و ئیتر مەزەندەی ئەوە دەکەم مرۆگەل لە نێو کۆمەڵەیە لە قۆزاخە رۆشنبیرییە نیمچە مەعریفییەکاندا بژیت، کە خۆی خودی خۆی تێر بەشدەکات و هەریەکەیان بەها و خود پراکتیزەکارییەکەی پەسەند دەکات. بەها و کردەوە رۆشنبیرییەکانی دیکەش فەرامۆش دەکا یا نەفرەتیان لێدەکات. منیش وەکو داڤیدهیوم رۆشنبیرییە تەقلیدییەکانی سەرچاوە گرتوو لە هەقایەتە خورافییە سەر زارەکی و تقوس ولێبوردەیی و قبوڵکردنی فرە جۆری و جیاوازی بە چاکتر دەزانم لەهەمبەر ئایینە عەقائدییە تێکستئامێزەکان، کە خولیا گەر و مەیلداری هیدایەتدانی هەموو رکابەرە دژەکانە، ئیدی مەزەندەی ئەوە دەکەم، کە هەر رۆشنبیرییەك بڕێکی شیاو لە مەعریفەی زانستی هەبێت، کە زەمینەی مانەوەی لە دەوروبەرە تایبەتەکەی بۆ بڕەخسێنێ، بەڵام ئەوەی لێرە چاوەڕوان ناکەم توانادار بێ بۆ هەڵکشان و فراوانکردنی ئەو سەرە مەزنە مەعریفییە بە جۆرێك تێگەیشتنێکی راستەقینە و ئیدراکی مەعریفی و بەهێز و کەڵەکەبووانە بۆ سروشتی " زانست " پەیدا بکات و بخاتەوە. لە واقیعدا رەگەزی مرۆیی سەردەمانێکی زۆر کتومت لەو حاڵەتەدا ژیان، بەڵام ئەو حاڵەتە نییە، کە لە بواری پراکتیزە کردندا دەیبینین. وێڕای ئەوەی بە تەنیا بەرهەمی یەکێك لەوانە، ئەوەش ئەمە بە خێراییەکی بێشومار و هۆگرییەکی بە لێشاو ئەنجام دەدات، هاوزەمان مەزەندەی ئاشوبکاریی لە چەندانیان دەکات و هەمەکیانەش ئەو ژینگەیەی خەڵکی تیادەژیێت، دەیگۆڕێ.

ئەمە بە سانایی، هەقیقەتێکی واقیعیە و منیش بێ ئاگا نیم لە رووبەڕوو بوونەوەیدا، چونکە ئاقیبەتی ئەو هەقیقەتە مەزنە بریتیە لە تێکەڵەیەکی ئامێتە کراوانە، هەندێکیان گرنگ و وروژێنەرن، چەندانی دیکەش تۆقێنەرو ترسێنەر، بەڵام من هەوڵ دەدەم ئیش لە سەر ئەوە بکەم، کە ئەوەی پێشتر ئیفتیرازی دەکا و دەیگرێتە خۆی، لەبەر ئەوەی بەشی زۆری تارادەیەك نا روون و لێڵ و شاراوەیە، بەڵام هەر هەمووی گرنگە: کەس بۆی ناکرێ بە راستی چۆنیەتی و هۆی کارکردنی ئەو

شێوازە مەعریفیە ئیدراکییە بەو هێزەی کە بیڕادەیە بزانێت و کەسیش کتومت بە چۆنیەتی هەڵقولانی نازانێت، هەروەها کرۆکە بە کۆتا هاتووە کۆمەڵایەتییەی چۆن دەکەوێتەوە. بەڵام لەوێدا گومان لە هەبوونی ناکرێت، وێڕای ئەوەی سروشتەکەی گشتیە و راڤەکردن و دەرئەنجامەکانی هەر هەموویان دژ دەکەونەوە، ململانەیەکی زۆر دەوروژێنن، فەلسەفە لە ماوەی هەر سێ سەدەی رابردوو بەردەوام و تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندیدار و بایەخدار بوو بەو کێشەیە (وێڕای پێڕەوکارانی پێشەنگی بە دەگمەن بە تەواوەتی لە بارەیدا روون و دیار بوون، هەڵبەت جگە لە وانەی دوابەدوایان داهاتن) و تیۆری سۆسیۆلۆجیش لەو کۆمەڵە پرسیارگەلە هەڵقوولا و هاتە ئاراوە.

جا لەبەر سەر سووڕمێنیە -میانڕۆ-بیەکەم، پێم وابوو چاو بخەمە سەر ئەو کۆمەڵگایانەی زێدە کارتێکراوترن بە جێگۆڕکێی جۆرایەتی ژیان بەهۆی مەعریفەی هەقیقی، ئەوەبوو بزوتنەوەیەکی بە شۆرەت تیایدا سەریهەڵدا، بزوتنەوەیەك هیچ وەڵامێك، بۆ ئەو گرفتانەی بخەمە روو، رەتناکاتەوە — خوداش دەزانێ چ متمانەیەکم بە چ وەڵامێ نییە بۆ ئەو پرسیارەی دووەم — بەڵام راستتر لە خۆیدا بە کردەیی نکۆڵی لە هەبوونی گرفتێك دەکات. بزوتنەوەیەك وا دەردەخات جیهان ئاوا دەبینێ تەنانەت ئەو پرسەشی تیا بەدیار ناکەوێ.

سەسوڕمێنیەکەم -میانڕۆ-یانەیە لەبەر ئەوەی وێڕای سەیر و سەمەرەیی ئەو دیاردەیە لە رووی هزرییەوە، وەلێ لە رووی کۆمەڵاتییەوە گەلەك لە پڕوهێکراییانە نییە، باڵادەستی رەهای شێوازی تازەی ئیدراکی و ئەو رێگەیەی لە میانیدا تۆڕی بیروباوەڕەکان لەو کۆمەڵگەیەی تیا سەرهەڵدەدات، لێکهەڵدەزرێنێ، ئەوە ئەو دووە زنجیرەیەکی تەواو لە پەرچەکرداری دژ بەو دەردەدەن، بە گشتی دەکرێ بە ((رۆمانسیزم)) ناو ببرێ، ئیدی هەرچەندە متمانەی کۆمەڵگە بە دەست کەوتنی مەعریفەی تازە، گەورەتر و زلتر بوو، بەو ئەندازەیەش پتر دەربەستی بەکارخستنێکی هەمەکیانە و بڵاو بوونەوەی، تیایە بەدەردەکەوێت، هەروەها لەلایەکی دیکەوە شیمانەی دەردانی ئەو هزرڤانانەی دەستی کۆمەککار دەگەزن، پەرەدەسێنێ.



ئەو کۆمەڵگایانەی بە شپرزەیی و گێرمە و کێشەوە بەرەو هاوچەرخێتی بوون رێدەکەن و ناشتوانن قایم و پتەوانە و بە متمانەوە دەسکەوت و سوودمەندییە تازەکان بخەنە ژێر چنگی خۆیانەوە، رەنگە بە رادەیەکی زۆرکەم شیمانەی ئەوە هەبێ رووبەرووی رۆچوون بن لەو کەشە ئاشوبگێڕیانە، کە لێیەوە بە توندترین شێوە زانست — دەکوتێتەوە -. وێڕای ئەوەی ئەمە کارێکی نەناسراوونادیار نییە، هەروەها کەمتر دەشێت ئەو کەرەستە هزریەیە پێویستانەی هەبێت، تا ئەمە ئەنجام بدات، بەڵام وڵاتی پیشەسازی بە راستی ساماندار، کە لە سەرتاسەری ((تۆڕی لوولەکەکان — شبکە الانابیب))ی — مەفهومیەتی — تازە چەسپ کراون، چون بە رەوانی و نەرم و نیانی بە بێ گرفت یا هەڵە کارەکەی دەکات، ئەو توانادار بۆ خاوەندارێتی (بەڵکە بە کردەیی هەیەتی)بەهرەی سەرزەنشت کردن و نکۆڵیکردن لە تێکڕای زانست و داوای گەڕانەوە بۆ ساکاریی ساویلکاییانەی دێرین یا وا پیشان بدرێ گوایە بە هەرحاڵ سادەکاریی کۆن و بەهرەی نوێ تارادەیەك هاوشێوەن و دەبێ مرۆش بە هیچ شێوەیەك، هیچ کامێکیان بەسەر ئەویدیکە بە باڵادەستتر لە قەڵەم نەدات و پێویستە بە پێی پێوەرە تایبەتییەکانیان هەریەکە لە سەنگی مەحەك بدرێن و چ پێودانگێکی نۆرماتیڤ لەو دیو تخوبی رۆشنبیرییەوە لەئارادانییە و گشت رۆشنبیرییەکانیش پاساوە خودییە ... رێژەییە شیاندراوەکانیان فۆرمەڵەدەکەن، کە لە بنەڕەتدا ناسروشتی و دەستکردن، ئەو پەلکێشی و جەزبە توندەیان تەنیا لەو جێگە هەڵەیە بەرچاو دەکەوێ، کە کەمتر پەیوەندی پێوە هەیەبەجۆرێك زۆرترین سوودی لەو سروشتە ریزبەندیەی مەعریفەوە بینی و دەستکەوت.

## فەندەمینتالیزمی ئەقلانیی

فەندەمینتالیزمی ئەقلانیی رۆشنگەرایی، کە من خۆم بە یەکێکی ئاسایی لەوان دەزانم، نکۆڵی لە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی وەحی گەوهەری ئاشکراکەری هەقیقەت دەکات، هەروا نکۆڵی دەکات لە زێدەکردنی سیفەتی رەهاگەرایی گەوهەری بۆ سەربیروبڕوا ئیمانییەکان، ئەمەش تایبەتمەندی جیای هەندێ دینی جیهانە لە قۆناخی دوای چەرخی — میحوەری - چوون هەڵوێستێك و پێگە و دەسەڵاتێك دەداتە پاڵ شتە سەلمێنراوە چەسپیوەکان و بەها دیاریکراوە گەوهەرییەکان، بە جۆرێك دەکەوێتە ئەودیو تخوبی دنیایی و رۆشنبیریی: ئەمەش تا ئەو رادەیە بەوەی رێژەگەراییان دەیلێین، دەچێت، ئەوانەی بە هەرحاڵ قسەیان لە سەردەکەین، بەڵام لە کاتێکا ئەو سیفەتی رەهاگەرایی بە سەر هیچ باوەڕێکی ئیمانییانەی رەگاژۆ و گەوهەری دانابڕێت — پێویست بە دڵنیاکردن ناکات ئەم یا ئەو بێت بە شێوەیەکی ببڕ و بنەبڕانە — وەلێ ئەو سیفەتە بە سەر هەندێ پڕەنسیپی مەعریفی نیزامی، کە دەشێ بە (پراکتیزەییانە practicability) ناوی بەرین، هەروەها بەسەر بنەماکانی هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی (نەخاسمە لە نوسخەکانتییەکەیدا) دادەبڕێت.

لەسەرمانە بە رێگەیەکی دیاریکراو بە دوای توێژینەوە ئەنجامگیرییەکانماندا بچین ئینجا بە مسۆگەری ئەو بنەمایە دەبێ بە تخوبڕی رۆشنبیریی — قەرزباری چ رۆشنبیرییەك نییە — بەڵکە لە مانایەك لە ماناکانی ئەودیو دنیایی هەڵکەوتووە، ئەو جیهانەی هەرچۆنێك بێت خۆمانی تیا بەدی دەکەین ، لەوێدا تاکە رێگەیەکی شیاو هەیە بۆ دۆزینەوەی! .

هەڵوێستی بنەڕەتی بناوانگریەتی رۆشنگەرایی ئەقلانی لەگشت ئەمانە پێکدێت:

رەهاگەرایی و نارێژەگەرایی لە رێبازی پراکتیزییانەدا و پشت بەستنی هەمیشەیی بە سیاسەتی چاوەڕوانی و چاودێریی، نەك بە رێژەگەرایی، هەروەها بڕوا هێنانێکی بنجاکوتاوی گەوهەری.



هوردە درێژدادرییەکانی میتۆدی زانستی و رێبازی پراکتیزەیی ئیدراکی، کە لە رەوتاری شۆڕشێکی زانستی دۆزرایەوە و لە چەرخی رووناکبیریی ساز و رێکخرا، هێشتاکە بەردەوامن لە وروژاندنی ململانێ و ناکۆکی، وەلێ دەشێ تارادەیەك بە شێوەیەکیکورتکراوە ئاوها دیاری بکەین: چ راستگەلی گەوهەری پێشوەختە، ئەولەویەتی پێ نەبڕاوە یا سەرپشکایەتی — ئیمتیاز — (ئەو کارەی بە یەك زەبری پەلاماردەرانەی زیاندەر، موقەدەس لە جیهان دوور دەخاتەوە) هەموو راستییەکان یەکسانن و گشت چاودێرانیش هاوشێوەن و چ سەرچاوەیەك یا سەلماندنە سەپێنراوەکان لە ئارادا نین خودان سەرپشکایەتی بن، دەشێ هەموان مایەی گومان و پرسیار بن لە توێژینەوەی ئەنجامگیریشدا گشت راستییەکان و هەموو بنەماکانی مایەی جیاکردنەوەن:

ئەنجامدانی توێژینەوە و ئەنجامگیریی هەمیشە لەبارە لەمەڕ ئەوەی داخوا دەشێ کۆمەڵە ئاوێتەکان فۆرمێکی جیاواز لەوەی پێشتر خرایەروو بە خۆوە بگرن. یاخود مامەڵەنەکردن لەگەڵ جیهان بەو پێیەی یەك کوتلەی گشتییە -ئەمەش ئەو شێوازە باوەیە، کە لە رۆشنبیرییە تەقلیدییەکاندا بەدیار دەکەوێ — بەڵکە بە رێگەیەکی پلە بە پلە بە سەر چەند بەش و پێکهاتە دابەشی دەکات، گەریش لەدیدێکی وردی تیژبینەوە بڵێین: گەرچی جیهان وەکو کوتلەیەکی هەمەکی گشتیی بەرچاو دەکەوێت، وەلێ هزر پەلوپۆی هەڵدەپاچێ و ورد و خاشی دەکات.

رۆشنبیرییەکان، جیهانگەلن لە کوتلەی گشتگیریی هەمەکییانە، بەڵام توێژینەوەی زانستی ئەنجامگیریی بەرابەر بەمە هورد و خاشکردنی بەڵگەی گەرەکە، پێویستییەکانیش ناتوانن خۆ لە ورد بوونەوە و لێکۆڵینەوە لابدەن. تیۆری مەعریفەی ئەزموونگەرایی دەڵێت گوایە زانیارییەکان بە کردەیی بە شێوەی کۆمەڵە ئامێتە بچوکەکان دەگەن (ئەمەش ناراستە بەو پێیەی ریوایەتێکی وەسپگەرێتیە) بەڵام پەندە بەکەلکەکە ئەوەیە پێویستە مامەڵەی ئاوای لەگەڵ بکرێ وەکو بلێی لەت کراوە. ئەو دابەشبەندییە لەتکەییەی کوتلە و کۆمەڵە هێشووەییەکان پرۆسەی دووبارە هەڵسەنگاندنی رەخنەگرانەی وێنەی

جیهان هان دەدات و تەکان پێ دەدات، دووبارە تاقیکردنەوە و سوسەکردنی گشت هاوبەندییەکان هەموو سیستەمە ئیدراکییە پووکاوەکان، جێگیریی و نەگۆڕییان لە دەستدەدەن، سەرباری ئەوەش ئەوە یاسای یەکدیگیریی و هاوریزییە جیهان هەڵدەسووڕێنێ، بەمەش باڵادەستی وجیاوازکاریی جیهان سندم دەکات و ئینجابە پێی گوزارە بە شۆڕەتەکەی ڤێبەر ((رزگار کردنی لە وەهمێکی تەلیسماوی)).

ئا ئەمەیە روئیاکە، بەڵام جارێکی دیکە سەرنج بدە، ئەو خەرمانەی پیرۆزیی دادەماڵێ و هەرچی گەوهەرییە هەڵیدەوەشێنێتەوە و تارای وەهمە تەلیسماویەکەی لە سەر لادەدات: هیچ راستیەك یاهۆ یا رووداو یا تاکەکەس یا دەزگا یا کۆمەڵەکان، خودان سەرپشکایەتی — ئیمتیاز — نین، وەکیدیکە، نە موجیزە و نە دەستێوەردانی ئاسمانیی و چالاکیی سیحری جادووگەرییانە یا ((کۆنگرە رۆژنامەوانییەکان)) نە فریادرەسە دڵسۆزەکان، نە کلێسە پیرۆزەکان یا کۆمەڵگە ئیماندارەکان، هیچکامیان ئەوەنین بڕوایان هەبێت بە زەرورەتی نهێنییە پیرۆزەکان وەکو ئامرازێکی رزگار بوون — خەلاسیبوون -.

هەموو گریمانە زەن - بییەکان مایەی لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەن و دەرگەی گشت راستییەکانیش لەبەردەم راڤەکردنە تەئویلییە تازەکان کراوەیە و ژێررکێفی ئەو یاسا یەکدیگیرەن، کە رێنادەن بە موجیزایەتی و رووداوی لە ئاسا بەدەری پیرۆز و دەخاڵەتی ((ئەویدیکەی جیاکار)) لە دنیایی دا، بەڵام ئەوەی سیفەتی رەهایەتی دەخرێتە سەر و هەڵدەبوێردرێت و دەبەخشرێت، رەنگە هەر خودی میتۆدەکە بێت، میتۆدەکەش سێبەری بە سەر جیهاندا جێدێڵێ: ئەو سروشتێکی رێکخراوی رێکوپێکی یەکدیگیرانە دێنێتە ئاراوە. هەروەها سیستەمی توێژینەوەی ئەنجامگیر ئەویش سێبەری خۆی جێدێڵێ. واپێدەچێ سروشتێکی سیستماتیزەکراوی بێ وێنە بێ، ئا ئەمەیە ئەو مانا راستەی دەبێت بیدەینە پاڵ ئەو بنەما کانتییەی دەڵێت ئێمە جیهانەکەمان ((دروست دەکەین)) ئەو سروشتە سیستماتیزەکراوو بە میتۆدکراوەی ملکەچی شەریعەتەکانە لە راستیدا سێبەری میتۆدە ئیجراییە ئیدراکییەکەمانن.



شۆڕشی کانتی کۆپەرنیکایی بریتییە لە نەبوونی رێگەیەك بۆ سەلماندنی ئەوەی کەوا جیهان دەبێ بەم شێوەیە بێ (ئەمەش پاساوی لوانی زانستە)، بەهۆی زەمانەتی شیانی جیهان بۆ توێژینەوەی ئەنجامگیرییانەی سەرکەوتوو) و ئەوەی لە قەرەمان دایە دەری بخەین بریتییە لەوەی جیهان هەر دەبێ ئاوا بەو شێوەیە بکەوێتە بەردەست و دیدە، گەر بە رێگەی دیاریکراو بیرمان کردەوە — بەڕاستیش ئێمە ئەوەدەکەین. ئەوە کارەکە بۆ ماکس ڤێبەری سۆسیۆلۆجیایی جێهێڵراوە، تاکو ئەوەی ئەمانۆێل کانتی فەیلەسوف دەستی پێکرد، ئەو تەواوی بکات و رای بگەیەنێ، کە تەنیا هەندێکمان بەو رێگەیە بیردەکەینەوە — سەرباری ئەوەی سەرکەوتنی کردەنی ئەو شێوازەی بیرکردنەوە، تێکڕای رەگەزی مرۆیی بەلای کەمی تا رادەیەك، هاندەدا، هەروەها پەرۆش و شەیدا دەکات بۆوەی بەخۆوەی بگرن.

بەڵام ئایا ئەو میتۆدە و ئەو چاوتیژیەی کە بەرجەستەی دەکات، بانگەشەی باڵادەستی و خۆ بەزلزانی دەکەن؟ پێم وایە دەیکەن، دوو جاریش. لەوێدا دووجۆر ((باڵادەستی خۆ بەگەورەگر)) بەلای کەمی هەیە: جۆرێك دەکەوێتە ئەودیو و دەرەوەی تخوبی رۆشنبیریی یا هەر رۆشنبیرییەك و جۆرێکیش دەکەوێتە ئەودیو یا دەرەوەی تخوبی جیهان. لەراستیشدا ئەپستمۆلۆژیای رۆشنگەرایی هەردووجۆری بە یەکەوە بە باڵای خۆی دابڕیوە. ئیتر ئەو ستراتیجیە ئیدراکییە تەبەنیکراوە، کە لێکهەڵوەشانەوە و لەتکردنی دەرهاوێشتەکانی بۆ توخمەکان و پۆلینکردنی لەژێر یاسای گشتی گەرەکە، ئەو ستراتیجە راستەیە لە هەر جیهانێکدا، بەهەمان شێوە، خۆی لەخۆیدا و مەعریفە بەو شێوەیە دەکەوێتەوە زێتر لەوەی تەنیا رووەتێکی ئیدراکی ئەو رۆشنبیریە یا ئەویدیکە یێت، هەڵبەت رۆشنبیریەکانی پێشووی چەرخی رۆشنگەرایی ئەو شێوە ئیدراکە مەعریفییە تایبەت بە خۆیان هەبوو شێوازەکانیشی لەوەی لێرەوە لەرووی وەسپەوە ئەنجامی دەدەین جیایە: بەڵام ئەمە کتومت ئەو هۆیەیە وای لێکردووە تا ئەو پلەیە لە رووی تەکنیکییەوە لاواز و نائەکتیڤ بێت و بەو رێگە زیاندەرانەیە لەسەر شانۆی جیهان نەمێنێتئەمەش ئەوکاتەی مەعریفەی راست ودروست بوو بە رەوزەنێکی

ڕووناکیبەخش و لێیەوە شەوەزەنگی سەردەم ڕۆشن بکاتەوە یاخود تیشکی بەسەر مێژوو بپرژێنی .

هەر هەموو نووسینەکانی ڕۆشنگەراییان هەمیشە پڕ بە پێستی خۆی ڕوون و یەکدیگیر و هاو ئاواز نەبوون، سەردەمی ڕۆشنگەرایی بە جۆش و خرۆش بوو بۆ نکۆڵیکردن لە باڵادەستی شکۆداریی ئایینی و پێداگرتن لەسەر پێویستی پەیداکردنی هەموو شتێك لە چوارچێوەی تاکە سیستەمی سروشتی ڕێکوپێکی (بەرنامەرێژ[٦٠]). بەڵام لە هەمانکاتدا سیستەمێکی مەعریفی ئەکتیڤ و ناوەکی بەلای هەموو بوونەوەرانی زیندوو و کۆمەڵگە مرۆییەکانی نێو ئەو سیستەمە سروشتیە شکایەوە، تا ئەو خاڵەش سەردەمی ڕۆشنگەرایی ڕێژەگەراییانە بوو، بەڵام مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دیدگایە هەمەکییانە بە ڕێگەیەکی ناڕێژەییانە ئەنجامدرا، کە ڕوئیایەکی بێ وێنەی ڕاست لە نێوخودی خۆیدا دەگرێتەخۆ، بەمەبەستی مەزەندەکردنی سیستەمگەلی ئەکتیڤ — لە ڕووی خۆماڵییەوە، گەرشیا بڵێین، بەمەش تەنیا تا ڕادەیەك ڕاستەو بەس .

ڕەوتی سەرەکی سەردەمی ڕۆشنگەرایی لەمەڕ ئەو بارگرژییەی نێوان بۆچوونە سروشتییە ڕێژەییەکەی لەمەڕ هەموو شتێ لە جیهان و هوشیارییە جیاکەی، کە سیفەتەکان دەداتە پاڵ خود، نەگەیشتووتە لێکحاڵیبوونێکی گونجاو، جا دەستکەوتێکی کانتیش بریتیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دژیەکییە بە هەمووماناى وشەوە، لە کاتێکا دەسکەوتی ڤێبەر لەوە خۆی دەنوێنی، ڕوونکردنەوەی سیاقی مێژوویی ئەو بارگرژییە بە گوزارشگەلێ هەڵە و کەموکوری تیانەبێ. ئەم دژیەکییە گەرشیا بڵێین کارێکی لابەلا نییە و دەرئەنجامێکی ناسەرەکی تەنیا بیرکردنەوەیەکی کەمتەرخەمانەش نییە، ئەو ڕۆچووتە ناخی لۆجیکی حاڵەتەکە و ئەوانەیشی کەمتر ڕاڤەکار و شلۆڤەکاری ڕۆشنگەرایی، کە خەریك و سەرقاڵی هۆڵەکانی نووسینگەکانی پەیوەندییە گشتییەکانی ڕۆشنگەران بوون، نەیانتوانی بە تەواوەتی بەسەر ئەو گرفتە زاڵببن و فەرامۆشیان کرد یا خۆیان لێ دزیەوە، بەڵام کانت، بەو پێیەی زێدە ڕەگاژۆترین هزرڤانی چەرخی



ڕۆشنگەراییە، لەم ڕووەوە گەلەك دیارورووناکارانە بوو، هەموو شتێك لە نێو سروشتدا، لە ڕاستی، ملکەچی یاساکانییەتی، بەڵام خودی مەعریفە و — فەزیلەی ئەخلاقی — لە دەرەوەی دانە (دەکەونە دەرەوە و سەرووی ڕۆشنبیرییەوە، کە ئەوساهێشتا بەو ناوەی نەناسرابوو).

کانت زۆر بە ڕوونی بینی لە نێو سروشتی درکپێکراودا، کە سیستەمێکی ڕێکخراو و یەکدیگیرە و ملکەچی یاساکانە، چ جێگەیەك بۆ ئەقڵی سەراپاگیریی و گەردوونیی و دەگمەنی تیا نییە، بەڵکە تەنیا جێگەی هۆیەتیی عیللەیی — السببیه العلیه — تیا دەبتەوە و کاتێکیش ئەمە بەسەر شێوە باڵازیندەگیەکان پیادەکرا، لە ڕاستیا مەبەست لێی گونجاندنێکی ئیدراکییانەی گشت بوونەوەرێکی زیندوو یا گشت ڕۆشنبیرییەك بوو، بەڵام سروشت، بەو پێیەی سیستەمێکی یەکدیگیر و  بێوێنەیە، ئەوە ئەو ڕۆنانە بەدیقەتە فۆرمەڵەکراوەی ئەقڵە ئاواهی بونیات نراوە لەمەڕ مامەڵەکردن بە یەکسانی لەگەڵ هەموو حاڵەتە هاوشێوەکان و پۆلینکردنی گشت دیاردەکان لە ژێر ڕێڕەوێکی تەفسیری سیستماتیزەکراودا. دەرەنجامی ئەو دیدوبۆچوونانە لە دوالیزمی بەڵگەئامێزی کانت دا ، کەپێی وایە هەموو شتێك لە نێو سروشتدایە(ئادەمیزادیش وەکو دیاردەیەك قابیلی سوسەکردنە) لە هۆیەتی - عیللەیی - سەرچاوەی گرتووە، جا پراکتیزەکردنی بەسەر ڕۆشنبیرییەکان بە شێوەیەکی ڕێژەییە، بەڵام ئێمە هەڵدەبوێرێ، بەو پێیەی توخمە ئەخلاقی و ئیدراکیەکان لە ئەندامەتیدا لە یانەی سروشت دان وڕێشمان پێدەدا بگەین بە مەعریفە و فەزیلەی ئەخلاقی بە هەرچی هەیە - دیار و جیاواز- لەڕووی دانسقەیی و ڕاست ودروستی .

بە واتایەك لە واتاکان، ئێمەین جیهانمان دروستکردووە، کە تەنیا وەك سێبەرێکی ئەقلانییەتەکەمان وایە و لەبەر خودی ئەو هۆیەش ناتوانین و پێویستمان بەوە نییە چەند پارچەیەك -لەت- بین، ناکرێ خودی خۆمان بەو پێیەی توخمە ئەقلانییەتەکانمان ببینین بە پێی نوسخەی کانتی لە — حیجەتگەریەوە  - بەڵام دەکارین بە دیقەت بەڵگە بێنینەوە بۆ هەبوونی

خودەکانمان، وەکو توخمی ئەقلانییەتی لەمەڕ تواناکەمان بۆ تاقیکردنەوە و تاقیکردنەوەی دەربەستی تیۆری مەفهومی و ئەخلاقی، جیهانی سروشتی ریزبەند ملکەچی یاسایە و فەزیلەی ئەخلاقیش ڕێکسازە، پابەندە بە یاسا، ئێمە هەردووکیانمان خولڤاندووم، چوون بەڵگەی بنەبڕی یەکلاکەرەوەی ئەو شتە پێکدێنن، کە خودە راستەقینەکانمان لە دەرەوەی ئەو سروشتەن، کە دروستی کردووە. سەبارەت بە کانت، هەروەکو دۆرکهایم دوای ئەو، رەگورپیشالی ناچارێتی چەمکایەتی تیۆریی ئەخلاقی هەمان شتە و لە نوسخەی – حیجەتگەریی - ڤێبەر هەولدرا چاودێری خۆ بەدیار خستنی مێژوویی ئەو خۆبەگەورە زانییە بالادەستییەی رۆشنبیرییەکانی پێشتر، بکرێ.

دەشێ بنەما ئەخلاقییەکانی کانت لە وابەستەگی بە ئەقلانیەت، پوخت بکەینەوە، چوون ئەقلانییەت لە ناوەڕۆکدا سیستەمێکی چەمکگەرایی ڕێکوپێك و سیستمازەکراوە و پەرچەکرداری هەلاوێردەکان (بۆ نموونە: بۆ بانگەشە ئیدراکییەکان) فۆرمەڵەدەکات، هەروەها سووربوون لەسەر مامەڵە کردن بە یەکسانی لە حاڵەتە هاوشێوەکان (وێڕای ئەوەی داخوا ئەوە لە بژارەیەکی ئەخلاقییا بێ یا لە راڤەکردنێکی ئیدراکی) هەروەها یەکگرتنی بە پێی توانا لە سیستەمێکی ڕێکسازی بە پرۆگرامکراو. بنەما ئەخلاقییەکانی کانت، هەروەکو رەفتار بەسەر ئیدراکی مەعریفیش پیادە دەکرێت، ئەویش لە راستیدا نزیکەیی زێدە بڕوا پێهێنەرە لە مەیدانی مەعریفەدا. لە تاقیکردنەوە و دۆزینەوەکاریی جیهاندا، پێویستە مامەڵە دەگەڵ گشت دەرهاوێشتەکان بکرێت، هەروەها هەموو زانیارییەکان و تێکڕای رووداوەکان بە یەکسانی، چ سەرچاوەگەلی رۆشنبەخشی نییە خودان سەرپشکایەتی – ئیمتیازات – بێت، چونکە کرۆکی گوناە لە دروستکردنی هەلاوێردەکان سەرچاوەی گرتووە واتە شتێك نییە / ناشێ وەحییەکی ئەودیو-میتا- هەبێت، هەقیقەتەکە ئاشکرا بکات و بدۆزێتەوە.

ئەوەیە بەکورتی بنەمای ئەخلاقی ئیدراکی راستەقینەی سەردەمی رۆشنگەرایی و بەشبەشکردنی دەرهاوێشتەکان و لێکهەلوەشانەوەی بۆ بەشە



پێکهاتەییەکانیشی گەرەکە، هەروەها رووبەڕووبوونەوە دەستپاکانەکەی دەگەڵ هەریەکێ لەو تیۆرە تەفسیریە پێشنیازکراوانە .

ئایینی تێکست ئامێزی تەوحیدی – حەسری – ئەویش بڕوای هەیە بە هەبوونی یەك تاکەهەقیقەت لەبری فرەجۆریی نا هەتاهەتایی کۆمەڵەکانی واتا: بەلام ئەو بیرۆکەی گەیاندنی ئەو دیدگایە تاکڕەوە بە ((سەرچاوەیەك)) خودان بالادەستی و سەرپشکایەتی بێ، رەتدەکاتەوە، تەنانەت گەر سنوورداریش بێت، هەروەها شانبەشانی رێژەگەرایی تەئویلی – نکۆڵی دەکات لەوەی گوایە نوسخەیەکی گەوهەری و دووماهی و سنووردار لە هەقیقەت، لە ئارادابێت، بەلام ئەو خاڵەی لەوی جیادەکاتەوە رەتکردنەوەی پەسندکردنی هەر قۆزاخەیەك لە واتا ئیدراکییە پەلبەستراوەکانە لە رووی کۆمەلایەتییەوە، کە لە قۆناغی پێشووی بەر لەسەردەمی رۆشنگەرێتی لە ئارادا بوو بەو پێیەی لە رووی راست ودروستی و شەرعیەتیەکەیداهاوشتەویەکسانە و دەشبێ سیفەتی رەهاگەرایی بە تەنیا بەسەر رێبازی پراکتیزەیی دابڕێ نەك بەسەر بیروباوەڕە گەوهەرییەکان، بەلام واتای ئەوەی ئێستا پەیوەستە بە هەلوێستە کۆمەلایەتی و سیاسییەکان، ئەوە هێشتا مایەی بیرکردنەوە و لێکۆلینەوەیە.

کەواتە، ئەوە هەرسێ بژارە سەرەکییە رەخساوەکانی کەشە هزرییەکەمانن: فەندەمینتالیزمی ئایینی و رێژەگەرایی و ئەقلانییەتی رۆشنگەرایی، جا بەو پێیەی سیستەمگەلی بیروباوەڕن لەمەڕ پەلکێشکردنمان، داخوا ئەو سیفەت و ئاکار و کەموکوڕیانەیان  دەبێ چی بن؟ .

بەر لە هەر شتێك، با لە فەندەمینتالیزمی ئایینی ڕابمێنین، بە بێ مشتومڕ دلنەوایی دەروونی بۆ خەلکێکی زۆردەخاتەوە و لەبەر هەندێ هۆ هەولمدا بیاندۆزمەوە،  ئێستاکە توانایەکی تایبەتی هەیە لە قەناعەت پێکردن وکارتێکردنێکی ئەکتیڤانە لە نێو تاکەکولتوورێکی تەقلیدی، ئەویش ئیسلامە، خاڵە لاوازەکانی دەبێ چی بن؟ .

سەبارەت بەوانەی لەمەڕ ئێمە، ئەوانەی لە ناخی هۆش وهۆشیارییاندا ئەو شتەیان تەقەت کردووە، ئەوەی من بە بنەمای ئەخلاقی کانتی یا رۆشنگەرایی

درککردن ناوم برد، واته وابەستەیی بە مامەڵە کردن دەگەڵ گشت بەڵگەکان بە تەجەرود و دەستپاکی، هەورەها لەگەڵ هەموو ئەو هۆیانەی بەو پێیەی لە رووی ئەوەی چ سیفەتێکی باڵادەستیان لانییە لەگەڵ یەکدا یەکسانن، ئەوە بەلای ئەوانەوە بیرۆکەی وەحی ئەودیو (میتا)ی ئاشکراکەری هەقیقەت کارێکە لە رووی ئەخلاقییەوە پەسەند نییە. هەروا ئەو تاکە بیرۆکەیەی پەیامی دووماهی، کە لە شوێن و کاتێکی دیاریکراو دابەزی، بەخشراو لە وردبوونەوە و پشکنینکاریی، بەجۆرێك مایەی هەڵوەشاندنەوە نییە، هەروەها بەدەر لە وردکردنەوەی بۆ بانگەشەپێکهاتەییەکانی و زەرورەتی ملکەچپێکردنی ئەو بانگهێشتانە بۆ وەڵامدانەوە و پرسیار کردن و گومان — هەموو ئەمانە بنەما دامەزرێنەرەکانی ئەو پرنسیپە ئەخلاقییە ئیدراکییە پێشێل دەکەن، کە بەلای ئەوانەی پێوەیان وابەستەکردین، خاڵی نەگۆڕە لەرووی روانینمان بۆ جیهان، یەك تاکە خاڵەکە .

بە زەرورەت ئەمە مانای ململانەوجیاوازیمان نییە لەگەڵ هەر بەشێکی دیاریکراوی پەیامەکە، گەرچی ئێمە ئەوە دەکەین، بەڵام هەقیقەتی حاڵەتەکەش لەمەڕ هەبوونی کۆتبەندێکی ئاوهایی مکومانە بمانبەستێتەوە، — گەرشیا بڵێین — دینی خۆنانوێنێت، ئینجا باوەڕێکی ئیمانیانەی گەوهەری دژ و جێگرەوە و دواتر ئەو بۆچوونەی پێی وایە دەبێ جیهان بەو شێوەیە یاخود ئەویدیکە بێت، وەك ئەو پەناگە ئارامە جێگیرە بنجداکوتاوەمان لە جیهاندا نییە، هەروەها ئەو تاکە دالّدەیەی هانای بۆ بەرین. لەبەر چەند هۆیەك ئەستەمە بپارێزرێ و هەوڵمدا لە بابەتی دیکە [٦٧] لای لێبکەمەوە، کە بە هەقیقەت خۆی لەوە دەنوێنێ، کە لە دووماهیدا تەنیا تاکە شێوازێکی راستەقینە و راستی مەعریفەیە هەیە، بە کورتی ئەو رەوتە سەرەکیە کولتووریەی ئەپستمۆلۆژی خۆرئاوایی، کە هەنووکە بە تەرزێکی باو دانانرێت، کۆنترۆڵی کرد، بە بێ گومان دووچاری زوڵم و خراپەکاریش دەبینەوە، بەڵکە لەمە خراپتریش، بەو پێیەی کە پۆزەتیڤیستین لە سونگەی ئەو قسەیەمان، بەڵام ئیتر ئائەوەتا گوتمان.

لۆجیکیانە، هەڵبەت فەندەمینتالێزمانی ئایینخواز لە ململانێدانە لەگەڵ رێژەگەراییان، ئەوانەی بەهای ئیمانە باوەڕییەکەیان هەرزانفرۆش دەکەن، ئەو



ئیمانەی گوایە خودان یەك ئیلهامی بێ هاوتایە، هەروەها پوختی دەکەنەوە بۆ تەنیا یەك ((سیستەمگەلی واتا))کە لە دروستی و رەواییەکەیدا هاویەکسانەو لە پراکتیکیشیدا ئەو رووبەرووبوونەوەیە زۆر بەروونی بە دیارناکەوێ، بناوانگران سەرنجیاندا و بە سووکایەتییەوە لە رێژەگەرایی و هەردوو حاڵەتی خەمساردی و کەمتەرخەمی باوی کۆمەڵگەی خۆرئاواییان دەڕوانی، هەروەها بایەخێکی زۆریان بە بناخە لۆجیکییە فەلسەفییەکانیان نەدا، رێژەییخوازان بە دەوری خۆیان، تەنیا پەلاماری ئەوانەیاندا، کە بەو پێیەی ((پۆزەتیڤیزمن)) رەخنەیان لێگرتوون و سەرزەنشتیان کردوون، واتە نارێژەگەراییەکان لە کولتووورە رۆشنگەرییە تایبەتەکەیان، بەڵام ئەوان ئەو گرنگییەی ناکۆکیەناتەباییەکەیان بەکەم دانا، کە لەرووی لۆجیکییەوە لە فەندەمینتالێزمی ئایینییان جیادەکاتەوە، تارادەیەك هەڵوێستەکەیان بریتیە لە : نالێبوردەیی لەئاست رەهاگەرایی تەنیا لە حاڵەتێك نەبێ گەر ئەو چەمکە بە پێی پێویست لە رووی رۆشنبیرییەوە نامۆ یان بیانی بێت و نەشیان توانیبێ بە تەنیا لە ژینگە خۆماڵییەکەیان بەرگەی بگرن .

بیانوو و بەرتەکێکی بەر رێژەگەراییان نەخاسمە لەرووی فرەجۆری تەئویلی ئەو هەڵوێستەی بە کورتی لامان لێکردەوە تا رادەیەکی زۆر بریتیە لە نەبوونی یەکدیگیریی و ریزبەندیی لایان، هەروەها بە بێ شك نیفاقە ناهوشیارانەکەیانیش. لە راستیدا رێژەییخوازانی تەئویلی ئاوها مامڵە لەگەڵ گشت دیتنە رۆشنبیرییەکان ناکەن بەو پێیەی هاوکوفن لە رووی دروستی و رەوایی و ریوایەتە وەسپکارییەکانیان لە بارەی سیستەمی واتا بیانییەکاندا وەك دەیخەنەڕوو هێشتاکە بەقووڵیی وحەنمیی دایکوتاوە لە نێوەندی ئەو ژینگە سروشتیەی، کە بە زمانی هەنووکەیی زانستی خۆرئاوایی درکی پێدەکرێ، تەنانەت ئەنترپۆلۆجیای پۆست مۆدێرنیزمانەش وەسفێك لەبارەی کردەوە سیحریەکان ناخاتەڕوو، بۆنموونە، لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو لە میانی ئەوەی بە سانایی بگوترێ، باشە، بەڵێ، لەو فەرهەنگەدا. سیحر بەراستی کاری خۆی دەکات، بەڵام تەنیا ئەوە وەسپ دەکات چۆن ((کاردەکات))، واتە ئەو شێوازەی بیروباوەڕە چۆن لەگەڵ تۆڕێکی فراوانتر لە

بیروباوەڕ و کردەوەکاندا دەگونجێ و دەسازێت، کە وا دەبینرێ وەك بلێی لە نێو سروشتێکدا کارەکەی ئەنجام بدات، کە هەر خودی خۆشیەتی بە هەمان ڕێگە لە هەموو شوێنێکدا کار دەکات.

ئەی چی دەربارەی خاڵە لاوازەکانی ئەقلانییەتی ڕۆشنگەرایی (نزیکترین شت بۆ "بیروباوەڕ- موعتەقەد" کە بتوانم پێڕەوی بکەم)؟.

ئەقلانییەتی تەنویری — ڕۆشنگەرایی — بەدەست چەند خاڵێکی لاوازەوە دەناڵێنێ، ئەوەش لە ڕووی بەکارخستنی وەکو بیروباوەڕێکی پراکتیکیانەی ئیماندار و وەکو بنەمایەکی دامەزرێنەر یا بۆ ژیانی تاکەکەسی یا سیستەمی کۆمەلایەتی. هێزوتوندی نازکیی و بێباریەکەی لە نێو جەرگەی تەنگژەکاندا ڕێ بە پشتگیریکردنی تاکە کەس نادەن و بەجۆرێك تارادەیەك مەگەر تەنیا بیرمەندەهۆگرەکانی ئەو جۆرە تیۆریزەکردنە بتوانن لە عەوامی خەڵك بگەیەنن. لە ڕوی هزرییەوە، تارادەیەك مەحاڵە بیگەیتێ، ئەویش بێتوانایە لەمەڕ پشتیوانیکردنێکی ڕاستەقینە بەجۆرێك بەفریای ئان و ساتی تەنگژەکان بێت، پراکتیکیانە، هزرڤانە خۆرئاواییەکان، کاتێ ڕووبەڕووی تەنگوچەڵەمە و کێشە کەسایەتییەکان بوونەوە پەنایان بردە بەر ڕێچکەگەلی ئەوتۆ هەردەدوڵەمەندتر لە ڕووی عاتیفیی ویژدانیی بەجۆرێك سۆزوبەلێن دەدا بە چاکبوونەوەی کەسێتی - شەخسی- و گەڕاندنەوەی بارە دروست و ساغەکە، هەر بۆنموونە: وەکو دەروونشیکاریی

ئایا پەیامە کرچوکاڵە تەجریدیەکەی ڕۆشنگەرایی لەسەر هەردوو ئاستی کۆمەلایەتی و سیاسی، حاڵی چاکتر دەبێ؟ لە ڕاستیدا، هەوڵمدا ئەداکەی چاکتر بێت، بیروباوەڕی فەیلەسوفی (فەرەنسایی) جۆرێ بوو لە پرۆگرامی کۆمەلایەتی، دیدگای سیستەمێکی ئەقلانی لەسەر زەوی، هەروەها وا پێویست دەکات ئەو بەمە ڕازی بێت، کاتێکیش سیستەمی شانشینی بەسەرچوو و دارما، ئەو دیتنە لە حەشارگەکەی لە چاوەڕوانی دابوو و شۆڕشیش دەرفەتەکەی بۆ ڕەخساند، بەلام ئەو نەگەییە سەردەمی ئەقڵ و سروشت، بەڵکە یەکەمجار گەییە چەرخی ئیرهاب، ئینجا دوای ئەمە دیکتاتۆریای ناپلیۆنی .



هەڵەکە چیبوو؟ سەدەی نۆزدەهەم کاتێکی زۆری بەدەستەوە بوو تا بیر لەو پرسیارە بکاتەوە، بەلام وەلامی زێدەدرێژدادڕو تۆژەرەوانە وهێزدارترو کارتێکەر و بەربلاوتر بۆ ماوەیەکی زۆر، مارکسیزم خستیەڕوو.

وەلامەکە دەلێت: بێهودەیی بێکەلکیی لەوەدایە هەوڵ بدەی حوکمی فەزیلە بەهۆی هەلێنجانی بنەماکانی لەسەر زەوی دابمەزرێنی، ئینجا بە سادەیی پیادەی بکەیت. هەروەك چۆن هزرڤانە ڕۆشنگەرییەکان ئەوکات کردیان، کۆمەلگەی مرۆیی بە گوێرەی ئەو ڕێگەیە کار ناکات (لەمەدا، مارکس بە تەواوەتی لەگەڵ ڕەخنەگرە کۆنسێرڤاتەکانی سەردەمی ڕۆشنگەرایی و شۆڕشی فەرەنسایی کۆك بوو، ئەوانەی لە ڕاستیدا زۆریان لێ فێربوو) ئەوەی پێویستە بەراستی بریتییە لە فامکردنی یاساکانی گەشەسەندنی کۆمەلگەی مرۆیی و بنەما ڕێکخەرەکانی فۆرم و کۆسپە بەکار و وەکتیڤەکانی، ئینجا کارکردن بە گوێرە و لە ژێر تیشکی ئەو بنەمایانە لە پێناو ڕزگارکردنی ئادەمیزاد و دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی و دامەزراندنی سیستەمێکی کۆمەلایەتی ئەقلانی و دروست لەسەر زەویدا.

مارکس بەوپەڕی خۆشبەختیەوە پێی وابوو ئەو بنەمایانەی لەلا هەیە و تەنانەت بە توانا بوو لە دەستەبەرکردنی گەیشتن بە ئاکامێکی بنەبڕ و دروست. ئەو ((دژیەکیەیە - التناقض)) لە ناخی کۆسپە ڕێگرە کۆمەلایەتییەکەدا ڕەگی داکوتاوە لەمەڕ دەستەبەرکردنی دوا پێداویستییەکانمان و لە کۆتاییشدا هەر بەخودی خۆی، خۆی تێکدەشکێنێ و کاتێکیش خۆی تێکدەشکێنێ، مرۆڤایەتی ڕزگاربوو، وەکو تاکەمیراتگرێکی جێماو، بەجێ دەمێنێ.

لەسەدەی بیستەمدا ئەو هەوڵە سۆسیۆلۆجیە زێدە ئالۆز و ئەزموونداره بۆ پراکتیزەکردنی پەرادیمی ڕۆشنگەرایی تاقیکرایەوە، هەروەها بە لای ئیرهاب و دیکتاتۆریەت لاربۆوە، بەمەش سەرەڕای گەندەڵی و بۆگەنبوونیش نوشوستییەکی سامناکی ئابووریی هاتەئاراوە، ئەم ئەزموونە ساڵی ١٩٨٩ دوای دوو سەدە لە بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسایی بە کۆتا هات .

مەبەست و مەراممان گەلەك پەیوەست نییە بەو نوشوستییەی بەسەر یەكێ لە بنەما دیاریكراوەكانی ئەو دیتنە تایبەتە داهات — هەڵوەشاندنەوەی موڵكایەتی تاكە كەسێتی، كە لە میانی پیشەسازیكاریەكی پێشكەوتووانە دەگات بە سێنترالیزەیەكی سەراپاگیریی كۆمەڵگە.

چوون لە كۆتاییدا ئاكامە كارەساتاوییەكەی لە رووی تەكنیكییەوە سەلمێنرا — ئەویش بنەماگەلی ئەوتۆن دەشێ خۆی لێ بەدوور بگیرێ یا راست بكرێتەوە یا جێگۆڕكێی پێ بكرێت، بەڵكە رەنگە ئەمە خۆبزوێنانە-ئۆتۆماتیكی- رووبدات، بەڵام شتێكی فراوان و زێدە گشتگیر هەیە بەراستی پەیوەندیدارە بە ئامانجمان، كە لەو خاڵە لاوازە خۆ دەنوێنێ، كە توانای فەلەج كردنی هەر هەوڵدانێكی هەیە بە مەبەستی دەربازكردنی سیستەمێكی كۆمەڵایەتی یەكدیگیر و سنووردار لەدەست روئیا گشتییەكەی رۆشنگەریی .

هزرڤانە رۆشنگەراییەكان، گریمانەكەیان بە شێوەیەكی جیاواز دانا: چوون دین و بیروباوەڕی خورافی سیستەمێكی كۆمەڵایەتی دیاریكراویان دەردا، واتە: ستەمكاریەكی ریزبەندانە و دۆگماتیزمانەی ئەوتۆ، كە هەردووكیان لە ژێر ركێفی فەرمانی خانەدان (نبلاء) و ئەكلیرۆسەكان دانە، كەواتە بیروباوەڕی راست بە شێوەیەكی تەریب سیستەمێكی كۆمەڵایەتی جیاواز دیاری دەكات، هەڵبەت زێدە باڵادەستیش . مێژوو نووسێكی ئەمریكی ئەمەی بە شارە ئاسمانییەكەی فەیلەسووفانی سەدەی هەژدەهەم[٦٢] ناو برد، گەریش -هەڵە- توانی سیستەمێك لە سیستەمەكانی فەرامانڕەوایی پێناسە بكات و رەوایی پێبدات، ئەوە بە مسۆگەری ئەوكات -راست - یش هەمان شت لەمەڕ سیستەمێكی دیكەی فەرمانڕەوایی دەكات. جا داخوا ئەو ئەنجامەی دووەم گەلەك چاكتر نییە؟ وەهەم بوو سیستەمی فەرمانڕەوایی چەوسێنەرانەی ستەمكارانەی خولقاند یا پاساوی بۆ هێنایەوە و هەردەبێت هەقیقەت قووت ببێتەوە و/ سیستەمێكی فەرمانڕەوایی ئەوتۆ پەسەند بكات كە یەكسانی و برایەتی و سەربەستی تیا رەنگبداتەوە.



بەڵام لە كاتێكدا هەڵە دەكارێ كۆمەڵگەیەك سنووردار بكات، ئەوە راستی ئەوەی لە توانا دانییە، هەقیقەت هۆكاری داخورانێكی كردەییە لەرووی روئیا یەكدیگیرە كۆنەكاندا، بەڵام لە رووی جێگۆڕكێ پێكردنی بە هەر ڕوئیایەكی دیكە، كە بەردەوامییەتی و پتەوێتی و كۆتاییە پەسەندەكەی و جێگیریە ئەخلاقییەكەی تێدا رەنگبداتەوە، ئەوە لەمە شكست دەهێنێ، ئیدی نەحاڵەتێكی سەقامگیر و نەدەسەڵاتێكی نۆرماتیڤانە، هەروەها لەو شێوازەی تاوتوكارییە راست وشەرعییە نە بارێكی سەقامگیر و نە دەسەڵاتێكی نۆرماتیڤانەش دێتەئاراوە.

بنەما ئەخلاقییەكانی رۆشنگەرایی لەمەڕ ئیدراك، بەراستی چەندین جۆری دەسەڵات و رێگەگەلی دیاریكراوی رەواییكردنی سیستەمی كۆمەڵایەتی بە دوور دەگرێ، بەڵام بە سانایی، چ پێشەكییەكی پتەوانەی لۆجیكی تیادا نییە، گەرشیابڵێین دەوڵەمەندە بە ماددەی فیكریی و بە تواناشە لە رووی بەرهەمهێنانی ئەلتەرناتیڤێكی كۆمەڵایەتی یەكدیگیری دیاریكراو، ئەو گریمانە پێچەوانەیەی، كە ئاماژە بە توانای دەدات بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەم شتە، ئەوە لە نێو جەرگەی روئیای ماركسیزم خۆی دەبینتەوە، كەواتە لەمەشدا هەڵە بووە؟ .

كەواتەكۆمەڵگە پیشەسازییە — زانستییە، زیندەگییە، سەقامگیرەكان، كە لە قۆناغی دوای سەردەمی رۆشنگەرایی بەدەركەوتن، تاكو ئێستا هەوڵی پراكتیزەكردنی ئەلتەرناتیڤی رۆشنگەراییان نەداوە، بەڵام چەقی لە شپرزەیی جۆرێك لە چارەسەریەكی مامناوەندی ناتەبا، بەبێ یەكدیگریی و هاوبەندیی، بەمەش سەری لێشێوا، ماركسیزمیش ئەو تاكە ئەقیدەیە نەبوو هەوڵی پراكتیزەكردنی دینێكی عەلمانی دا. نازییەكان هەڵوێستێكی كەمتر یەكدیگیر و رێك و لەبار و رێكخراویان لە رووی بڕوا و باوەڕەوە هەبوو، بەڵام وێڕای ئەمە بیرۆكەی سەرەكی یا ئیلهامە مەركەزییەكەی بە روونی دیار و جیا بوو، ئامێتەیەك بوو لە بایەلۆژی و كۆمیۆنالیزم (communalism)، راستیش بوو لەوەی، كە ئادەمیزاد بەشێكە لە سروشت دەبێ بەهەند بگیرێ: دەستەبەركردنی پێداویستییەكانی، رێكسازكاریی و خودسەلماندنی لە كۆمەڵگەی خۆماڵی،

بەدیکردوبینیەوە، ئەمانە ئەو هۆکارانەن، کە قووڵترین پاڵنەر و هاندەری ناخمان تیژ دەکەن. شوناسمان لە پاڵنەرە دنیاییەکاندا حەشار دراوە، نەك لە نموونەگەلی بەستەڵەکانەی بێگیان، سەرپشکایەتی پێچەوانەی دڵنەرمی و بەزەییە، وێڕای نکۆڵیکردنی نازییەکان لە توخمی مرۆیی و یەکسانیی لەرووی رۆشنگەرایدا، بەڵام بە شێوەیەك، مەبەستێك بەردەوام بوونی ودەستکەوتەکانیشی نواندووە، زۆر بە جیددی بیرۆکەی لکاندنی ئادەمیزاد بە سروشت و بەدوورگرتنی باڵادەستی شکۆیی لە مەڕ بەشەرعی کردنی کۆمەڵایەتی بەخۆوەگرتبوو. خەڵکی لەمەڕ کۆمەڵگەی خۆماڵی و خود سەلماندندا، پێداویستییەکانیان پەسەنددەکەن ، گرووپەکەمان — جەماعەت — گرنگە جا بە پێی قسەی گرووپخوازێك گرووپێکی بایۆلۆجییە و ئادەمیزادیش بەو پێیەی گیانلەبەرێکی کۆمەڵایەتییە و سوورە لە سەر سەلماندنی خودی خۆی، ئەوە دەستپێکە پێشەکییە لۆجیکییانەکەی پرەنسیپی نوێی رەفتاریی ئەخلاقی دەنوێنێ، نازیزم لە پراکتیکدا — ئەزموون — بەهۆی شەڕ و کوشتار پاشەکشەی کرد، هەروەکو چۆن مارکسیزم لەمەڕ پراکتیزەکردندا بەهۆی پەرەستاندنی ئابوورییەوە پاشەکشەی کرد، جیاوازییەکەش لە هەقیقەت لەوەدایە هەردوو دینی عەلمانی لە هەمان ئەو گۆڕەپانە شکستیان خوارد، کە خۆیان هەڵیان بژارد، بوو بە شوێنی رۆژی حیساب .

پووکانەوەی ئەو دوو بیروباوەڕە عەلمانییە دژ بەیەکە، گەرچیش بە هێزەوە ئاماژە دەدا، بە زەرورەت مانای ئەوە نییە، کە تیۆرێکی پوختە ئامێزی عەلمانی رەخساو لەبەردەم رەگەزی مرۆیی بەدوادا نەیەت یا بوونی نەبێت. چوون بۆمان ناڵوێ بە راستی بە شێوەیەکی رەها جەخت بکەینە سەر نەبوونی سکێچێکی عەلمانی رەخساو، سەرچاوە گرتوو لە باوەڕێکی ئاوها بە شێوەیەکی چاك کار بکات، هەرچەندە چارەنووسی ئەو دوو نموونەیەی لە سەدەی بیستەمدا پراکتیزەکران بە لای ئەوەدا دەشکێتەوە خەڵکانێکی زۆر هەبن بڕوایان بە بنبەستیی ئەو رێگەیە هەبێت، بەڵام تەنانەت گەر ئەو رێگەیەش لە ئارادا بوو و مایەی پراکتیزەکردنیش بوو، ئەوە ئەوەی گومانی تیا نییە ئەوەیە، کە رەچێتەیەکی



بێهاوتای سیحریی نییە ئەو بۆچوونە عەلمانییەی مەعریفە دەیخاتە ڕوو. لە چاکترین باردا، دەشێت، بەڵام ناشێت دەربەستانە بێت. کەواتە؟ .

هاوبەندیەتی کۆمکاری نێوان ئایدۆلۆجیا و سیستەمی سیاسی بە پرۆگرامکراو چەندین قۆناخی مێژوویی بڕیوە، یەکەمیان قۆناغی بەر لەسەردەمی — میحورەییە- کاتێ دین، لە بنەڕەتدا لەرێی سەماکردنەوە گوزارشی لە سیستەمی کۆمەڵایەتی دەکرد، سەماکردنێکی مەبەستدار لەمەڕ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، کار و ئەرکی بە رەواییکردن و سەلماندنیان بوو، بەڵام تەواوکاریە سەرزارەکییەکان بە تەنیا هەقایەت بوون، نەك بیروباوەڕ یا پرەنسیپ یا بەڵگە سەلمێنەرەکان. لەوێدا نەململانێی بە مشتومڕ و نەداهێنراوە — **مهرطقة** — بە هەرتەقەبووەکان هەبوون. بە شەرعیکردنی ڕێوەرەسمە نەریتیەکان و سیستەمی کۆمەڵایەتی تاکە —گشتێکیان- پێکهێناوە هەر ئەوەتا لێکجیا دەکرێنەوە، ئەو سیستەمە بڕواداریەی تواناداری لەرووی بە شەرعیکردن — کە هەر ئەوەتا دەشێ بەو ناوەی لە قەڵەم بدەین - خواست و مەبەستی ئەوتۆی نەبوو، کە هەبوونێکی زاتی سەربەخۆ یا شەرعیەتێکی گشتگیرانەی هەمەکیانە و راستی گەرەك بێت. گەر شیا بڵێین، چ ئیمپریالیزمیەکی عەقائیدی لەئارادا نەبوو — گەرچیش هۆیەکە تەنیا ئەوسا خۆی لە نەبوونی چەند عەقیدەیەك بینیەوە، بەڵکە بە تەواوەتی بە پێچەوانەوە: جۆرێ لە گۆشەگیریی ئەنقەستانە هەبوو. گەیشتن بە کەشە داوو نەریتەکان سنووردار بوو، هەروەها هیدایەتدانی خەڵکی رێسا باوەکە نەبوو، پەیرەوکردنێکی سنووردار تایبەت بە خاوەن - ئیمتیازەکان — بوو و بەس .

هەموو ئەمانە لەگەڵ چەرخی — میحوەری — گۆڕدران، چوون کۆتەنجامی خوێندنەوە و نووسین بەرز بۆوە و بەپێی ئەگەرەکە شارستێنێتی و سێنترالیزمی سیاسی مەزنتر بوون و کۆمەڵانی دانیشتوانیش، ئەوانەی لە ژینگە لەبارەکەیان هەڵقەنران و لەرێی خستنەرووی رزگارکردنێکی گشتگیرانە، سەرکەوتوو، ئامانجدار، فریودران: گەلەك ئایینی جیهانی پەیدابوون بەجۆرێك نەك بە تەنیا یارمەتیدانێکی سنووردار، بەڵکە خەلاسبوونێکی هەمەکییانەشیان خستە روو و بە ئەقیدەش

بڵاوبۆوە نەك بە کەش وریێورەسم - تقوس - و لە دەقی نووسراوی پیرۆزیش بەرجەستەکرا نەك لە ئەداکردنی کەشە داو و نەریتییە پیرۆزەکان، بەڵام ئەو ئایینانە خولیاومەیلی لکان و یەککردنی فاکتۆرە تایەفی — مەزەبی و ئەقیدەیی — جیهانی و فەردانیەتیان (ئیندیڤیدوالیزم) هەبوو، هەروەها مەیلی تەرزی ((پرۆتستانت))یشی تیا/ لە نێویا باو و پەرش و بڵاوبوو، بەجۆرێك رووە دەقئامێز وحەرفی وفەردانیەتەکەی تەکانی پێدەدا و ئەو پێناوکارییە رێك خراوەی (نێوان ئادەمیزاد و خودا) هەڵوەشاندەوە، پێی داگرت لەسەر پەیوەندی راستەوخۆی نێوان تاکەکەس و هەقی موتەعالی/هەقیقەت، بە شێوەیەکی گشتی، ئەو بزووتنەوە چاکسازییانە سەرکەوتنێکی هەمیشەییان بەخۆوە نەدیوە: فاکتۆرە تایەفییە — مەزەبییە — گەلدۆستییەکان دووبارە خودی خۆیان دەسەلمێننەوە بۆ وەدەنگهاتنی پێداویستیە قووڵە کۆمەڵایەتییەکان، بەڵام لە بۆنەیەکی دیاریکراو و لە نێو کولتوورێکی دیاریکراودا، یەکێ لەو بزووتنەوە ریفۆرمخوازانە بە بەراورد لەگەڵ ئەوانیدیکە چاکتر بەخت یاریی بوو و توانیشی بەشی باکوریی — خۆرئاوای کیشوەرێك بگۆڕێ بەو ئەندازەیەی بکارێ پاڵپشتی سەرهەڵدانی شارستانیەتێکی زانستی پیشەسازی بێت، رۆشنگەریی پەرچەکرداری ئەو سەرکەوتنەی بەرجەستە کرد، نەخاسمە لە نێو ئەو گرووپە لاگیرە بەرچاوتەنگانەی کەمتر سەرکەوتن بەدەست دێنن: بانگەشەکارانی بێوچان تێکۆشان بۆ فامکردنی ئەو سەرکەوتنە ئابووریی و کۆمەڵایەتییانەی، کە کۆمەڵگە تازە هەرە لە پێشەکان بەدییان هێناو وای کرد پرسی چاولێکردنی کارێکی شیاو بێت، بەمەش پێشنیازکردنی نوسخەیەکی عەلمانی لە دینی رزگارکەر، ئەقیدەیەکی ناچورالیزمانە بۆ رزگاربوون خودان شەرعیەتی گەردوونیی و راست ودروستی گشتگیرانە بێ و تیایدا ئەقڵ و سروشت جێگەی تەقلید و وەحی بگرنەوە و ئەمەشیان بەهۆی درککردنیان بەرۆڵی مەعریفەی عەلمانی تازە لە سیستەمی نوێی کۆمەڵایەتی، ئەنجامدا.

هەوڵی پراکتیزەکردنی ئەو بیروباوەڕە عەلمانییە تازەیە لە رووی سیاسیەوە دووجار نوشوستی هێنا: ئەمەیە دیرۆکی ئەوەی لە سەرو بەندی هەردوو شۆڕشی



فەرەنسایی و رووسیایی روویدا، ئەوانەی هەردوو هەوڵە مەزنەکەیان بۆ پراکتیزەکردنی رۆشنگەرایی بەرجەستە کرد، هەروەها بەکارخستنی پێشەکییە مەزنەلۆجیکییەکەی لە بەراوردکردنێکی بێسنووری لۆجیکیانەی زانستی — سیاسی. هەروەها بەلشەفیەکانیش، لە مارکسیزمدا، دیباجەیەکی بچووکی لۆجیکیانەی درێژدادڕ و مکومیان گەلاڵە کرد بوو لە شێوەی سۆسیۆلۆجیای مێژووی جیهانی: مەرامیشیان ئەوە بوو بەهۆیەوە لەیەککاتدا هۆی نوشوستییان لە خولی یەکەم و هۆی چۆنیەتی سەرکەوتنیان لە سایەی سەرکردایەتییەکەیان لە خولی دووەمدا راڤە بکەن. لە ئاکامدا دوای دووسەدەی تەواو لە ئابلوقەدانی گۆڕەپانی پراکتیزەکاریی سیاسیانە لەلایەن نوسخە ئۆرگیناڵەکەی رۆشنگەرایی، هەوڵوکۆششەکەیان نوشوستییەکی کوشندەی هێنا، بەڵکە بەشێوەیەکی دڵتەزێنی ئاوهاکە مایەی دڵنەوایی و سەبورییە، زێتر لە هەوڵدانە ئۆرگیناڵەکە، نوشوستی هێنا.

دەبێ چی بکرێ؟ بە سانایی ناکرێ بۆ ئەو رێژەگەراییە گۆشەگیرانەیەی فۆبیای مۆڵخواردنی هەیە بگەڕێینەوە، کە رۆمانسیەکان بەو شادومانیە پێمان رادەسپێرن: هەر کۆمەڵگەیەکی لۆکاڵی پشت دەبەستێ بەکۆمەڵگە تەوتەمییە تایبەتەکەی! چونکە ئێمە بە روونی تخوبە جیاکەرەوەکانی نێوان کۆمەڵگە خۆماڵییەکانمان دەستنیشان نەکردووە: ئەوەیشی هەمانە بەنەرم و نیانی و سەقامگیریی دەناسرێتەوە، مەعریفەی راستەقینەیە بە هیچ کۆمەڵگەیەکی تەوتەمی پەیوەست نییە، بەڵام لە هەمووشیان بەدەرە — ئازادە — ئێمەش پشتی پێ دەبەستین و ناشکرێ لە راستیدا خۆمانی لێ بەدوور بگرین یا لێی هەڵبگەڕێینەوە، گەرچیش هەندێ لە ئێمە بە گاڵتەوە وایاننواند گوایە ئەنجامی دەدەن، رێژەیگەرایی تەئویلی ئەو بنەما لۆجیکییە فەلسەفییە دەخاتە روو، کە تەنیا بەسەخافەتە عەبەسییەکەی لە رووی لۆجیکییەوە (ئەمەش لە خۆیدا گەلەك گرنگ نییە) جیا ناکرێتەوە، بەڵکە مەدح وستایش و رێنمایی وئامۆژگاریەکەی لەمەڕ شتێکە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە قابیلی پراکتیزەکردن نییە.

کەواتە، ئایا دەتوانین پێڕەوی بناوانگرانی ئایینەنووسراوەتێکستئامێزەکانی جیهانی بکەین؟ پێدەچێ رێنوێنیان بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکە بەراستی قابیلی

پراکتیزەکردن بێ، بەهەرحاڵ، لە نێو یەکێك لەو ئایینانەی لە جیهاندا هەن، بەڵام ئەو جۆرە چارەسەرە، وێڕای توانستی هەناردنی لەو ناوچەیەی رەنگە ئێستا تیایدا باوبێ، بۆ لیبرالەکانی وەکو ئێمەمانانیش لە میراتگرانی سەردەمی رۆشنگەرایی، پەسەند و قبووڵ نییە. بەلای کەمیش لە نێویەکێ لەو شارستانێتیە جیهانیانە، وا پێدەچێ لیبرالەکان لە رووی تفاق و ژمارەوە بەهێزتر بن، ئاوهاش بنجداکوتاون بکارن بەرگری هەر هەوڵێکی لەم چەشنە بکەن، کەواتە ئەو شێوازەی پێویستە پەیوەندییە تازەکەی نێوان ئیمانی ئیعتیقادی و سیستەمی کۆمەڵایەتی وەری بگرێ، دەبێ چی بێت؟ .

بەلای منەوە چارەسەری سەرنجراکێش دەشێ بە دینی دەستووری ناوی بەرین. هاوشێوەی مەلەکییەتی دەستووریی (دامەزراوەیەکە لە هەندێ دەوڵەتدا بە چاکترین شێوە کاردەکات) بەڵام لە راستیدا مەلەکییەتی دەستووریی چییە؟ سیستەمێکە تقوس و سیمبولی رەسەنی مەلەکییەت دەپارێزێت، لە کاتێکدا ئەرکی راستەقینەی بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگە دەداتە دەست بوارێکی زێدە تەکنیکی و دنیایی و عەلمانی، کە خەرمانەی قەداسەت دەورەی نادات، جا بە گوێرەی ئەو رێسا گریمانەییەی ئاماژە دەدات بە زەروورەتی شانۆی کەشە داو و نەریتیەکان و بەو پێیەی ((زانستی نوێ)) یا ناتوانێ بەرهەمی بێنێ یا دانەیەکی کارەساتاوی لێ بەرهەمدێنێ، هەردوو بواری کەشی داو و نەریتیانە و بواری هەقیقی واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی لێکجیا دەبنەوە. کەشەکانیش ئێستا حاڵەتی هەقیقەتی رەنگ پێنادەنەوە، بەڵکە ئەو دابەشبەندییە رابردوویە یا خەیاڵیەی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان فراوانتر دەبێت بەرادەی جیاوازی دیار و بەرچاوی نێوان رەمزییەت و پرۆسەی داڕژتنی بڕیار، کەشەکان — تقوس — واقیعی کۆمەڵایەتی رەنگ پێنادەنەوە، بەڵکە فەنتازیای کۆمەڵایەتی، وەلێ ئەو رۆڵی هەیە لە سەقامگیریی کۆمەڵایەتی لە میانەی دوورەپەرێزی لەوەی چ خەرمانەیەکی پیرۆزیی بەسەر نێوەندەکانی هێزە کاتیی یا تەکنیکییەکان دابدات و بیخاتە مەترسییەوە بەهۆی گرێدانی رەوایەتییەکەی بەو بیروباوەڕانەی، کە رەنگە سبەی



پووچەڵبوونەوەیان بسەلمێنرێت واش پێدەچێ ئەو جیاکردنەوەیە تارادەیەك بە شێوەیەکی چاك کار بکات.

کەواتە، وا دیارە مەلەکییەتە دەستوورییەکان بەراست و دروستی کار و ئەرکەکانیان بە ئەنجام دەگەیەنن، بەڵام خاڵی سەرەکی لەو (موحاجەجەیەی) ئێستادا خۆی لە پێشنیازکردن و پیاهەڵدانی ئەو پرەنسیپە لە بواری رەمزییەتی سیاسی نابینتەوە، بەڵکە لە روونکردنەوەی سروشتی تین وتوانای پراکتیزەکردنی لەو بوارە فراوانتر و گشتیترەی پەیوەندی نێوان ئیمانی ئیعتیقادی و پراکتیزەکردندا، ئێمە — بە ماناو مەبەستە وردەکەی دەستەواژەکە — لە جیهانی دوای سەردەمی رۆشنگەرایی دا دەژین، ئیتر بیرۆکەی دەستەبەرکردنی دانەیەکی عەلمانی — دنیایی وەحی، سکێچێکی بەرایی رێخۆشکەریی سیستەمێکی کۆمەڵایەتیمان پێدەدا، کە مایەی سەرنجراکێشان و شەرعیەتێکی ئەوتۆیە، بەراستی شۆرەتە چاکەکەی لە دەست دەدات و ئەو نوشوستیانەیشی بەخۆوەی بینین روون و ئاشکرا، تۆقێنەرانە بوون، بەڵام لە هەمانکاتدا رۆشنگەریی سەرکەوت لە رێکخستن و ریزبەندیی ئەو تاکە بنەما رەوایانەی مەعریفەیەکی راستەقینەی شەرعی، هەروەها نکوڵیکردن لەو بنەمایانە لەلایەن رێژەگەرایی تەرزباوەوە لە رووی لۆجیکییەوە بەکارێکی نا ماقووڵ و عەبەسی دادەنرێ، لەرووی ئەخلاقیشەوە بە شتێکی قێزەون و کرێت لەقەڵەم دەدرێ، تەنیاش وەك ئیدعاکردنێکی نا سروشتی دەستکرد دەکرێ بشێت، تەنانەت گەر پەیرەوکارانیشی درك بەو راستییە نەکەن، لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ کاروبارە جیددییەکان و کاتێك ژیان و بەختەوەری بەشەر لەمەحەکدان و دوای ئەوەی سەرچاوە سەرەکییەکان جڵەوی وەلا و وابەستەگیمانیان گرتەدەست، ئەوە تاکە جۆرەکەی مەعریفە، کە دەکرێ بەشێوەیەکی شەرعی ئامادە و بەکاربخرێ، هەر ئەوە پڕ بە پێستی مەرجەکانی پێوەرەکانی فەلسەفەی رۆشنگەریی وێڕای ئەو هەقیقەتەی ئاماژە دەدا بە ئەستەمی داڕژتنی ئەو پێوەرانە بە دیدێکی ورد تەواو یا تا ئاستێکی قبووڵکراوانە-گشتی-، مەحاڵیشە دەسەڵات و هێزە قەناعەت کەرەکەی بخاتەڕوو و روونی بکاتەوە.

ئەو چارەسەرە مامناوەندییەی، کە دەشێ پیادە بکرێت، یەکسان بە مەلەکییەتی دەستووری لە بواری باوەڕیی ئیمانداریێتی، بەجۆرێ بە دەسەڵاتێکی دوالیزمی دووسەرە دادەنرێت، هاوزەمان وەلانانی ئەنقەستانەی ئەو درزە دیارو جیایەی نێوان هەردوو جێگە تایبەتەکەی خۆیان، بەشێوەیەکی ناڕوون و پەنهان، لە بواری بەشەرعیکردنی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان بیروباوەڕە تەقواییە کۆنەکان لە بۆتەی رێورەسمە — تقوس — کۆمەڵایەتییەکان دەپارێزرێن و لەبواری ئیدراکی مەعریفی جیددی فەرامۆش دەکرێن، گرووپی رۆشنبیریی، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، لەنێو کلێسەی ئینگلتەرادا سەریهەڵدا، هەردوو دەسەڵاتیان لا قبووڵەو رێش بە تاکە کەسەکان دەدات، هەرکاتێ ویستیان جێی خۆیان بە گوێرەی پلەکانی ئەو کێرڤە چێ بکەن و هەرگیزیش ناچاریان ناکات یا ئەوەیان لێ ڕەچاو ناکات، لەو پێگە خود هەڵبژێردراوەیان هاوئاواز و چوونیەك بن: دەکارن لە میانەی رێچکانەی لاتەنیشتا بەپێی سیاقەکە، یا بۆنەکە، یا مگێزەکە، بجووڵێنەوە.

دیڤید هیوم، یەکێك بوو لەو یەکەمین کەسانەی رووبەڕووی ئەو گرفتە بوویەوە، لە کتێبە سەرەکییەکەی لە بارەی دین، مێژووی سروشتی دین، لەروانگەی ئەو جیاوازیە بەرچاوەی پەیوەست بە جیاوازیکردنمان لە نێوان بناوانگریەتی و رێژەگەرایی، ئیش لەسەر ئەو کێشەیە دەکات و خووە مگێزییە لێبوردەییەکەی دەیخاتە سەر رێی بەچاکتر زانینی رێژەگەرایی، لەو فۆرمەی تیای بوو و لەوانەشە هەر ئاواهی بمێنێتەوە، پڕ بەپێستی جیهانە کلاسیکیەکە، بەر لە سەرهەڵدانی ئایینی تێکستئامێزی نووسراوی عەقیدەیی، ئایینە تەقلیدییە کۆنەکان، لەگەڵ یەکتریدا لێبوردە و مەدەنییانە بەعەوامی خەڵکەوە پەیوەست بوون و چەمکی دنیاییش لەو جیهانەدا سەرچاوەی گرتبوو، ئینجا پاشان عەقیدە نووسراوە تێکستئامێزەکان جێگەیان گرتەوەگوایە توانای پراکتیزەکردنێکی گشتگیرانەیان لایە، ئیدی ملی وەبەر راوە دوونانی — هەرتەقە (hetermdmxy) — نا. هیوم سەرنجیدا، کە ئازادی لەگەڵ کاهینە سەرپەرشتکارەکانی کەشە داو و نەریتییە کۆنەکان بەبرەوتر بوو بە بەراوردکردنی چانسەکەی دەگەڵ پیوریتانێتیی شێتگیرانە



بە عەقیدەوە، بەڵام ئەوەی لە جیهانی نوێدا مایەی سەرسوڕمانە — هەروەها هیومیش لە وتارێکی لەبارەی ((بیروباوەڕی خورافی و دەمارگیریی ئاینی)) و لە کتێبەکەی مێژووی بەریتانیای مەزن، سەرنجی ئەوەی داوە — ئەوەیە، کە ئازادی لە سایەی پیوریتانێتیی شێتگیرانە بە عەقیدەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەو حاڵەتەی ژێر رەحمەتی کاهینەکاندا! سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا.

لەگەڵ ئەوەشدا دەمارگیریی ئایینی — پیوریتانیەکان — زێدە مەیلی لایەنگیریی کردنی ئازادییە لە چاو بیروباوەڕە خورافییە کۆنەکان، ئەمە چۆن دەبێ؟ ئەمە لەگەڵ لۆجیکی بیانووەسەرەکیەکەی ناکۆکە، بەڵام ئەوەندەی راستگۆیی و دڵنیایی لەلایە بەئەندازەیەك بکارێ سەرنجی کارەکە بداو نیگەرانی بکات و وەڵامێکی نیمچە بڕواهێن بخاتەوە پەیوەست بەوەی لە پاشان ماکس ڤیبەر بە ((**الروتنة**))ناوی برد.

نابێت ئەو چارەسەرەی هیۆم خستیەروو ئاستەنگ بێ بۆمان، گرنگ ئەوەیە رایەو گرفتەکەیشی بەروونی داڕژتووە، واش دیارە راڤەکردنەکە لەوەخۆی دەنوێنێ، کە — پیوریتانیەکان — ((دەمارگیرن)) ئەوانەی دۆڕان، بەڵام تێکنەشکان، لێبوردەییان هەڵبژارد و لەگەڵ سیستەمی بەسەرچووی کۆنیش هاوئاواز بوون، ئینجا روویان کردە بازرگانی کردن؛ ئەو حەماسەتە هەڵایساوەیان، کە دواجار تەکنیکێکی تازەی زادەی زانست کە ئەوان رۆڵیشیان تیا گێڕا، پاڵپشتی کرد، کاری لەسەر تەقدیسکردن و بەشەرعیکردنی چارەسەرە مامناوەندییەکە کرد، لەرێی ئەو بووژانەوە بەربڵاوەی ئابووریی و پەیدابوونی کۆمەڵگەیەك، ئیمانێکی لاوازی میانڕۆیانە شانبەشانی مەعریفەی عەلمانی پەرەسەندوو و ناجێگیر تیا بحەوێنەوە، ئەمەش لەژێر سایەی هەر وەك ناوم برد ((دینی دەستووری)) ، ئەو لە رووی رەمزییەتەکەی رێژەییخوازە، هەروەها ئەوەی بشێ بە نیمچە باوەڕی ((بەشەرعیکراو)) ناو ببرێ، بەڵام رەهاگەرە لە کۆششە دڵکارەکەی بەدوای خواستی هەقیقەتی دنیایی، ئەو کارەی واپێدەچێ وەکو بڵێی ئەو تیۆرە سیاسیە قبووڵکراوەیە، کە هاو زەمانی رەهاگەرایی ئەقڵانییە (نەك دنیاییانەی دژ بە سروش، کە لە روونترین وێنەیدا لە مارکسیزم خۆی دەنوێنێت).

بەبێ گومان ئەو جۆرە شێوازەی دەستووری لە بەردەم هەندێ رەخنەدا، پەردەی لەسەر دادەماڵدرێ، بە تەواوەتی رەنگە ئەوە بشێ، ئەو سمینەی بۆ بەدیهێنانی ((موجیزەی زانستی)) ئەنجام درا تەنیا بەهۆی هەبوونی دەستەیەك پیاو دەکرا بەئاکام بگات، ئەوانەی بەگەرموگوڕی و راستگۆیی و دڵسۆزییەوە سەرقاڵی هەقیقەت بوون، ئایا ئەو خولیا شەیداگەریەی هەقیقەت دەتوانێ ئەو ئادەتەی بەخشینی جۆرێکی جیاواز لە هەقیقەت، کە بە رۆژەکانی هەفتە، دەژمێردرێت، بترازێنێت؟ لە بەرابەریشدا کۆمەڵگەکان توانیان رووبەڕووی تەنگژە سەرەکییەکان ببنەوە بەهۆی هاریکاریی بیروباوەڕێکی ئیماندارانەی راستەقینەی کۆمەڵایەتی، ئایا داخوا هەمان شت دەکات بە هاریکاری ئیمانێکی پووکاوە، ناجیددی، دابڕاو لەو بیروبڕوا رەگاژۆیە لەبارەی حاڵەتی شتەکان لە واقیعی راستەقینەدا .

جگە لە هیوام، وا مەزندە دەکەم هەردوو پرسیار وەڵامێکی سەلمێنەرانەی بەلای کەمی کاتیی بدرێنەوە: راستترە، دەربازبوونی ئەو ئەنجامگیرییە توێژینەوەییە راستەقینەیە لەرووی کۆمەڵایەتیەوە دابڕاو لە بارەی سروشتی جیهان، ئەمەش ئەوکاتەی بە دەزگا دەکرێ و بەکاریگەرێتی و کارتێکەریەتەکەی دەزانرێ، تەنانەت لە چوارچێوەیەکی ئەقڵی هەرە هەل پەرستانەش، هەروەها کەمتر بە زەبر و دیقەت و بیانووگرانە، ئیمانێکی زیادەڕەو رەنگە بەقەد ئەوەی یاریدەدەرە، کۆسپیشە لەبەردەم زاڵبوون بەسەر تەنگژە کۆمەڵایەتییەکان و نیەت ونیازپاکییە پراگماتییەکانیش دەشێ بەپێی پێویست بن، ئەمە هیوایەکی ماقووڵە، وێڕای بێسوودی بانگەشەکردن لەرووی توانستی زامنکردنی ئەو هیوا گەشبینانەیە، بەهەرحاڵ، لە توانا دانییە لەچاو ئەوەی لەئارادابوو داهێنانە تر بێت(٦٣) .

ئەنجامە کارەساتاوییەکەی ئەو روئیا عەلمانییە دژ و یەکدیگیرە لە بواری پراکتیکیدا سەلمێنرا و کۆمەڵگە سەرکەوتووەکانیش، ئەوانەی مەعریفەی تازەی عەلمانی — بەڵام بەبێ بە پیرۆزگرتنی لەرووی فەرمییەوە — بەکاردەخەن، ئەوانەن لەسەر بنەماکانی یەکلاکردنەوە و چارەسەرە مامناوەندییەکان دامەزراون و



بەردەوامیش لە بەکارهێنانی زمانی زاراوەیی بەر لە قۆناغی پیشەسازی لە پرۆسەی بەشەرعیکردنی — شەرعانییەتی — کۆمەڵایەتی، بەڵام بە جیددیەتێکی سنوردار مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و رێشی پێنادا خۆ لە پرسە ئیدراکی و بەرهەمهێنەرە گرنگەکان هەڵقورتێنێ، هەروەها ئەوەش لە قاڵب دەدات، هەریەك لە بەرهەمە ئایدیۆلۆجییە لابەلایەکانی ((مەعریفەی تازە)) بەهەندبگیرێ، کە گوایە روئیایەکی خەلاسبوونی تازە و عەلمانی و ((زانستی)) دەخاتەڕوو و ئەویش ژیانێك دەژیت وەکو ئەوەی ئەو پیاوەی لەرووی تەکنیکی تازەدا تۆڕی لوولەکەکان و رووناکی و هەیکەلێکی بیناکردن بۆ خانووەکەی مەیسەردەکات، بەڵام هەموو ئەو پارچە کەرستەوکەلوپەل و نەخشونیگارانە لە تەرزی کۆنن. بەم رێگەیەش دەشێ هەست بە ئاسوودەیی و دڵارامی بکات و لە هەمانکاتدا ئەو تاسەوتامەزرۆییەی بەو رێککارییە ئیستاتیکییە دەستەبەر بکات، هەر هیچ نەبێ لە رواڵەتدا، ماکس ڤێبەر بەجۆرێ لە بێزاندنێکی قێزەویانە سەیری ئەو ناتەباییە زمنییەی ئەو هەڵوێستەی کردووە، بەڵام من پێم وایە لەتوانامان دانییە چاکترمان پێ بکرێت.

بناوانگرییێتی ئەقلانی میانڕۆی راسپێردراو، هەوڵنادا نموونەیەکی رکابەر دژی سەلەفە دینییەکەی، هەروەکو رۆشنگەرایی کردی، بخاتەڕوو، ئەو بەتەنیا لەوەی پەیوەندداره بە شێوەی مەعریفە بناوانگرە، دووریش نییە لەرووی ئەوەی شێوەیەکە لە فەزیلەی ئەخلاقی، مکومانە پێدابگرێ لەسەر ریزبەندیی وهاوکوفیی لەرووی مامڵەکردندا سەبارەت بەگشت (لەوخاڵەدا رارایی دامدەگرێ: لە بواری مەعریفەدا، یەکدیگیریی ئەقلانی بە شێوەیەکی پراگماتیزمانە زامن دەکرێ، هەروەها گەر شیا بڵێین دەسەپێنرێ ئەوەش لە میانەی هێز و سەرکەوتنی لەرووی پراکتیزەکردندا، ئەمەش بەسەر فەزیلەی ئەخلاقی پیادە ناکرێت .

حاڵی حازر، بونیاتێکی پیشەگەرییانەی بزۆز، کە لەخۆیدا زادەی سروشتی نەشونمای ئابوورییە، جۆرێك لە یەکسانێتی بنەڕەتی فەرمی، چێ دەکات و بنەمای ئەخلاقیش بەهەمان شێوە بەختی لە مامڵەکردنێکی هاوشێوە هەیە، کە بە

شێوەیەکی بەرفراوان پەیوەستە پێی — بەڵام من دەپرسم داخوا ئەمە لە دووبارە پتەوکردنی بونیاتی هەیکەلی پیشەوەریی دەربازی دەبێ، گەرهاتوو ئەمە لە هەرکاتێك لە کاتەکاندا، روویدا) جگە لەمە پەنا دەباتە بەر یەکلاکردنەوە و چارە مامناوەندییەکان لەگەڵ تێکڕای ئەو پرسانەی پەیوەستن بە وردودرشتیی و ناوەڕۆکەکەیەوە. ئەمەش گەر تۆگەرەکتە ئەوە گوێڕایەڵیەتییە بۆ نەهلیسیزم. کە رووی وێکچووی نێوان ئەو و رێژەگەرایی فۆرمەڵەدەکات، جا بەو پێیەی ئەو هۆیانەی پێویستن نارەخسێن، ئەوە دەشێ مرۆ رازی بێت لەسەر ئەو شیمانانە لەرووی پەرەگرتنێکی کتوپڕی خۆماڵیی و کۆسپەکانی هاوسەنگی خۆماڵیی نێوان دەسەڵات و چێژ — زەوق — ئەوە زەخرەفە رۆشنبیرییەکانمانن گوێڕایەڵانە ملکەچی رێژەگەراییین، نەك مەعریفەیەکی جیددی .

پێم وایە رێژەییخوازان، جا ئەو دەمامکەی بە روخساری خۆیان دا بڕیوە هەر چییەك بێت — بانگەشەکارانی ((پۆست مۆدێرنیزم)) تەنیا حاڵەتێکی مگێزانەی توندڕەو و ئاشوبگێڕ و بەسەرچووانەی ئەو هەڵوێستە دەنوێنن — وەسپێکی وردەکارییانە و قبووڵکراو لەمەڕ ئەو — چۆنیەتییەی — تیا گەرەکمانە، یا دەبێ گەرەکمان بێت، دەخاتە ڕوو، ژەمە خواردنێك (بەهەرحاڵ لە هەر ئێوارەیەك بێت) و چۆن ماڵەکانمان بە کاغەزی دیوارپۆش دابپۆشین، بەڵکە تەنانەت بەهۆی نەبوونی ئەلتەرناتیڤێکی چاکتر، چۆن چۆنی وێنە زیهنییە خودییەکەمان لە ژیانی رۆژانەدا دابڕێژین (گەرچی من لە زۆربەی ئێوارەکاندا، لیستی ژەمە تەقلیدییەکانم لە پۆست مۆدێرنیزمی پێ چاکترە) ئەو چاوو بیر تیژییەیان لەسەر رواڵەتە زەخرەفییەکان پیادەدەکرێ، نەك دەگەڵ بنەمابونیاتنەر و وەزیفییەکانی ژیانمان، کاتێکیش تاکو ئێستا هەوڵی پیادەکردنی روئیا تیژە دوورمەوداکانیان دەدەن، ئەوە لاساکردنەوەیەکی گاڵتەجاڕیانەی ناکۆك بە ئەقڵە لەرووی ئەو رۆڵە راستەقینەیەی مەعریفەیەکی جیددی لە ژیانماندا، بەڵکە تەنانەت بۆ پراکتیزەکردنی کۆمەڵناسیش، وێڕای ئەوەی من متمانەم بە بەها راستەقینەکەی نییە، دیارە



کۆمەڵگەکان ئەوسیستەمانەن لەمەڕ بەربەستە واقیعییەکان لە میانەی سروشتێکی بێهاوتادا کار دەکەن و دەشبێ ئاوها بەو شێوەیە تێیان بگەین، نەك بەو پێیەی سیستەمگەلی - واتان — تەنانەت گەر واتا تەوزیمییەکانیش بەکردەنی رۆڵی خۆیان گێڕا (تارادەیەك هەمە جۆر) بەڵام بانگەشەکردن بە پێچەوانەی ئەمەوە بە تەنیا بە هەڵەیەکی کوشندە لەقەڵەم نادرێ، بەڵکە لەخشتەبردنی خودیشە، ئەو هەڵەیەی ئەو ئیدیعایە دەیکات زۆر بەروونی ناکۆکە دەگەڵ ئەوەی بە تەواوەتی لەمەڕ رێچکە و شێوازەکانی دیکە دەیزانین، ئەوە دەستخەڵەتاندنێکی فریودەرانەی خودە.

بناوانگران رێزیان هەیە، بەو پێیەی ئەو هاوڕێیانەن دانپیانەرانە هەروەکو ئێمە بڕیار لەسەر یەك تاکە هەقیقەت دەدەن و بەو پێیەی ئەوانیش پێشینە فیکرییەکانمانن، خۆ بەدوور دەگرن لە خود فریودان لەمەڕ رێژەگەرایی گشتگیریی سەراپایی و بەبێ رۆچوونە نێو توندڕۆیی لەمەڕ پەرستنی پێشینەکان، ئەوە ئێمە بە ئەندازەیەك لە رێز و نەوازش و شکۆداریی قەرزباری ئەوانین، گەر ئایینەکانی تەوحید و یەکگرانەی جیدییانە نەبانە، ناشڵێین شێتگیرانە بە تەوحید و — وەحدانییەت — ئەوە هەرگیز ئاراستەکەی سروشتی ئەقڵانی رۆشنگەرایی رووناکی بە چاوی خۆیەوە نەدەبینی.

بە پێی گشت شیمانەکانیش وابەستەگی بە وەحی تاکوتەرای ئاسمانیی، مەرجێکی مێژوویی پێشوەختەی سەرهەڵدانی سەرکەوتووانەی ئەو سروشتە بێهاوتایەی فۆرمەڵەکرد بەجۆرێك دەکرێ بەشێوەیەکی - پەرەلێل — چوونیەك پێی بگەی.

ئەوە ئەوحەزوتاسەوخولیایەیە کە بەراستی بەشەریەتی فێرە ( یاسای سێیەمی مەرفوع ) کرد: رەنگە ئەو سەمتەی گریکەکان بۆ لۆجیك و (ئەندازە و گرامەر) گەر بە تەنیا پشت بەوان بەسترابا ئاوا تێرو تەسەل نەبایە بەبێ پاڵنەرێکی بەهێزیی ئایینی لەمەڕ جیهانێکی تاکوتەرا رێکخراو و سیستمازەکراو، هەروەها ئەوفەرامۆشکردنە پاشیە لەمەڕ گەمەکاریەکی ناچوونییەکی مانۆرانەی

هەلپەرستانە، هەرگیز ئەستەم بوو پەرچوویەکی — موعجیزە — ئیدراکی مەعریفی بقەومێ، بەڵام ئەو ڕێزلێنانە وابەستەمان ناکات بەشاردنەوە و پەنهانکردنی ناکۆکییەکانمان لەگەڵ ئوسوولییەکان، لە راستیشدا ڕێزگرتن لەو هەقیقەتەی لەوانەوە بەمیرات بۆمان ماوەتەوە، لەگەڵ خودی خۆیدا راستگۆ نابێت، گەر هاتوو بە کڕ و کپی پەردەپۆشیمان لێکردو شاردمانەوە .

بیرۆکەی هەبوونی وەحی ئەودیو — میتا — سەرچاوە تایبەتیەکەی پێ پەسەند تر و/ چاکترە، جارێکی دیکەش بەهۆی -بەڵگەیەکی زەقی بازنەیی- خودی خۆی دووپات دەکاتەوە ناکۆك لەگەڵ هەمان ئەو پرەنسیپە ئەخلاقییە ئیدراکییەی، وێڕای گشت کرچوکاڵیی و لاوازیەکەی، لە نێو جەرگەی شوناسمدا دەیبینمەوە، هەڵبەتە ئیتر مرۆ خۆشوازە بەو ئیماندارە ئوسووڵیانەی، کە تاسەو خولیای ((دیالۆگ))کاریان بەکاردەخەن بۆ گەیاندنی ئامادەباشیان لەمەڕ قبوولکردنی یەکلاکردنەوە و چارەسەری مامناوەندیی: ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییانەی قابیلی پراکتیزەکردنن لەسەر ئەو یەکلاکردنەوەیە دەوەستن و ڕێزگرتن لە ئادەمیزادیش لەمەڕ جیددیەتی هەڵوێستی ئوسووڵییەکان لەرووی هەقیقەت و سوپاسگوزاریی لێبوردەیی لە کێبڕکێدایە لەگەڵ ئیعتیرازی لەسەر ناوەڕۆکی بیروباوەڕە بنجداکوتاوە ئیمانداریەکەیان .

خودا فێری کردووین بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و یەکدیگرانە بیربکەینەوە، ئەو زانستەش ڕێمان نادات هەر بانگەشەیەکی وەحی ئەودیویانە — میتا —لێ قەدەغە قبووڵ بکەین.

سەبارەت بە ڕێژەگەراییانیش، مرۆ هەر هێندە دەڵێت:

وەسپێکی نایابتان بۆ ئەو شێوازەی، کە تیایا لیستی خواردنمان یا کاغەزی دیواریی ماڵەکەمانی هەڵدەبژێرین، پێشکەش کرد، بەڵام بەو پێیەی وەسپێکی واقیعیانەی ژیانە لەو جیهانەماندا و ڕێبەرێکی ڕێنیشاندەرانەی رەفتارە، ئەوە هەڵوێستێکە مایەی پێکەنینە. رەنگە ئێوە بەهاندانی یەکلاکردنەوە و چارەسەری



مامناوەندییانە لەرووی سیاسیەوە کارێکی چاك بکەن. گەریش ئەو ناڕوونییە — غموز — ی ئەو شێوازەی پێچاوەتەوە، کە دەیخەنەڕوو و ئەو هەڵوێستەی وەریدەگرن، هاریکاری ئاسانکاریی و هێورکردنەوەی رەوشەکە و هێنانە ئارای یەکلاکردنەوەیەك لە نێوان ئیمانداران و نەیارانیان بێت یا لە نێوان خودی ئیماندارە رکابەرەکان خۆیان، ئەوە ئێوە بەمە تەنیا خزمەت بە بەرژەوەندیی گشتی دەگەیەنن.

## پەراوێزەکان

1- S. Kierkegaard, Kierkegaar's Concept of Dreadm teans. Walter Lowrie, London: Humphrey Milford, Oxford University Press, 1944.

2- W. Herberg, Protesant-Catholic-Jew: Ab Essay in American Religious Sociology, new edn, Garden City, NY: Anchor Books and Double-day,1960.

3- D. Martin, A General Theory of Secularization, Oxford: Blackwell, 1978.

4- E, Gellner, Muslem Society, Cambridge: Cambridge University Press, 1981.

5- W. W. Bartley, The Retreat to Commitment, London: Chatto&Windus, 1964.

6- M. A. Cook, Muhammad, Oxford University Press, 1983.

7- Cf. N. R. Keddie (ed.), Scholars, Saints and Sufis, Berkeley, CA: University of California Press, 1972.

8- Ibn Khaldoun, Muqaddima, trans. F. Rosenthal, London: Rout ledg&Kegan Paul. 1958.

9- P. Crone and M. Hinds, God's Caliph: Religious Authority in the First Centuries of Islam, Cambridge: Cambrtdge University Press, 1986.

10- Cf. H. Laoust, Les Schismes dans I' Islam, Paris: Paris: Payot, 1965.

11- Ibn Khaldoun, Muqaddima.

12- D. Hume, 'The Natural History of Religion', in Hume on Religion, ed. R. Wollhetm, London: Collins, 1963.



13- F. Engels, 'Contribution to the history of Christianity', in Die Neue Zeit, quoted in R. Galltssot and G. Badia (eds), Marxisme et Algerie, Paris: Collection, 10/18. UGE, 1976.

14- E. Loon, Sovremennaya Filosofiya Istorii, Tallin: Eesti Raamat, 1980, to be published in English as Soviet Marxism and Analytical Philosophy of History, London: Verso, 1992.

15- B. Turner, Weber and Islam: A Critical Study, London, Routledge&Kegan Paul, 1974.

16- V. Maher, Women and Property in Morocco: Their Changing Relation to the Process of Social Stratification in the Middle Atlas, Cambridge: Cambridge University Press, 1974.

17- R. Danziger, Abd al-Qadwr and Algerians: Resistance to the French and Internal Consolidation, New York: Holmes&Meier, 1977.

18- E. Durkheim, The Elementary Forms of the Religious Life, trans. J. W. Swain, London: George Allen&Unwin, 1915 (1971).

19- Cf. H. Munson, Jr, Islam and Revolution in the Middle East, New Haven, CT, and London: Yale University Press, 1988.

20- 'Ayat' Allah Khumayni, Islam and Revolution: Writings and Declarations of Imam Khomeni, trans. Hamid Algar, Berkeley, CA: Mizan Press, 1981.

21- Said Amir Arjomand, The Shadow of God and the Hidden Imam: Religion, Political Order and Societal Change in Shi'ite Iran from the Beginning to 1890, Chichgo, IL: University of Chicago Press, 1984.

22- 'Ayat' Allah Khumayni, Islam and Revolution.

23- M. Weber, The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism, trans. Talcott Parsons, New York: Allen&Unwin, 1930 (1950).

24- See J. Spencer, 'Anthropology as a kind of writing', Man, n.s., vol. 24, March 1989, pp. 145-64.

25- R. Fardon, 'Malinoweki's Precedent: the imagination of equality', Man, vol. 25, no. 4, December 1990, pp. 569-71.

26- J. G. Merquior, The Veil and the Maske: Essays on Culture and Ideology, London: Routledge&Kegan Paul, 1979.

27- P. Rabinow in J. Clifford and G. E. Marcus (eds), Writing Culture: The Poetics and Politics of Ethnography, Berkeley, CA: University of California Press, 1986.

28- Ibid., p. 245.

29- Ibid., p. 246.

30- Ibid., pp. 284 and 249.

31- T. Aorno et al., The Psitivist Dispute in German Sociology, trans. G. Ades and Frisby, London: Heinemann Educational Books, 1976.

32- H. Marcuse, One0Dimensional Man, London: Routledge&Kegan Paul, 1964.

33- T. Aorno et al., The Psitivist Dispute in German Sociology.

34- See for instsnce Clifford and Marcus, Writing Culture, P. 132.

35- An extreme version of liberation from epistemological critique is the acarchism of Feyerbend, Against Method: Outline of an Anarchistic Theory of Knowledge, London: Verso, 1979.

36- Rabinow, p. 236.

37- Ibin., p. 241.



38- Ibin., p. 252.

39- Ibin., p. 25.

40- G. E. Marcus, 'Ethnography in the modern word systrm', in ibid., p. 167.

41- C. Geetz, Works and Lives: The Anthropologist as Author, Cambridge: Polity, 1988, pp. 59; 70 and 71.

42- Ibid., p. 71.

43- Rabinow, p. 253.

44- N. Barley, The Innocent Anthropologist: Notes from a Mud Hut, London: British Museum Publication, 1983; and Not a Hazardous Sport, London: Viking, 1988.

45- Marcus, 'Ethnography in modern world system', p. 169.

46- Rabinow, p. 252.

47- C. Geetz, 'Antirelativism', American Anthropologist, 1984, pp. 263-78.

48- I. C. Jarvie, 'Rationality and relativism', The British Journal of Sociology, no. I, March 1983, pp. 44-60.

49- Geetz, 'Anti anti relativism'.

50- Ibid.

51- Ibid., p. 276m fn. 2.

52- London: Routledge, 1945 (1961), vols I and II.

53- K. R. Popper, Objective Knowledge: An Evolutionary Approach, Oxford: Clarendon Press, 1972, p. 261.

54- Geertz, 'Anti anti relativism', p. 264.

55- K. Jaspers, Vom Ursprung und Ziel der Geschichte, Munich: Piper Verlag, 1949, pp. 15-106.

56- S. N. Eisenstadt (ed.), The Origions and Diversity of Axial Age Civilizations, Albany, NY: State University of New York Press, 1986.

57- Geertz, 'Anti anti relativism'.

58- C. Geertz, Negara: The Theatre State of 19th Century Bali, Princeton, NJ: Princeton University Press, 1980.

59- Rabinow, p. 253.

60- Baron d' Holbach (P. H. D. Holbach), The System of Nature, or Laws of the Moral and Physical World, trans. H. D. Robinson, New York: Lenox Hill (Byrt Franklin), 1970.

61- E. Gellner, Legitimation of Belif, London: Cambridge University Press, 1974.

62- C. L. Becker, Heavenly City of the Eighteenth Century Philosophers, New Haven, CT: Yale University Press, 1932.

63- Max Weber, Science as a Vocation, ed. P. Lassman, and I. Velody, London: Unwin Hyman, 1989.